زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی ٢٠

# بەسەرهاتی
# پێغەمبەران
# بۆ منداڵ و لاوان

چاپی دووەم

نوسینی
ابو الحسن علی الحسنی الندوی



ئارامی گەڵاڵی
کردویەتی بە کوردی

مەبەست لەم زنجیرەیە

## زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

١. دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردیە بە گرنگترین وکاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەررێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.

٢. ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسوڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامیی و سازێنەری بێداری و قیامەتی ئیسلامیی پیرۆزن.

٣. شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیانە لە گشت کۆت و بەند و بۆچونی تەسکی حزبایەتی و تاکڕەویو ڕەوتگەرایی.

٤. بناغەیەك بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسوڵمانی کورد تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆرانکاریانەی هەبێ کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە.

دەگەڵ ڕێز و تەقدیرمان بۆ بیروڕای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەمو بیروبۆچونەکانیان بین.

با دەستوریشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت.

﴿ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾ الزمر- ١٨

نوسینگەی تەفسیر

# بەسەرهاتی پێغەمبەران

## بۆ منداڵ و لاوان

نوسینی

ئەبولحەسەن عەلی ئەلحەسەنی نەدوی

ئارامی گەلاڵی

کردویەتی بە کوردی



ناوی پەرتوك بە عەرەبی: قصص النبيين للأطفال (١-٢)
ناوی نوسەر: أبوالحسن علي الحسني الندوي
نۆرەی و ساڵی چاپ: سێزدەم: ١٤٠٥ ك - ١٩٨٥ ز
چاپ و بڵاوکردنەوەی: مؤسسة الرسالة
ناوی پەرتوك بە کوردی: بەسەرهاتی پێغەمبەران بۆ منداڵ و لاوان
ناوی وەرگێر: ئارامی گەلاڵی
پێداچونەوەی: عبدالله سكتانی
نەخشەسازی ناوە: شنۆ حمدامین
نۆرە و ساڵی چاپ: دوەم: ١٤٣٠ ك- ٢٠٠٩ ز
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
ژمارەی سپاردن: (٧٠)ساڵی ٢٠٠٢
تیراژ: ٢٠٠٠دانە

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٢٢ ٥١ ٦٠ ٤٦٠ ٠٧٥٠ - ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

## بەناوی خوای بەخشندەمیهرەبان

**منداڵە ئازیزەکان!**

دەزانن نوسەری ئەم بەسەرهاتانە پیاوێکی چەند زانا و لێزان بوە؟، دەزانن جگە لەم پەرتوکەی بەردەستتان چەندین پەرتوکی تری داناوە؟، دەزانن ئەم بەسەرهاتانەی چەند بە ئاسانی و شیرینی بۆ نوسیون، من دڵنیام ئەگەر بیخوێننەوە یان گوێی بۆ بگرن سودێکی زۆری لێ وەردەگرن.

لەم پەرتوکەدا بە بەسەرهاتی پاکترین و ڕاستترین و بەرزترین مرۆڤانی سەر زەوی ئاشنا دەبن، فێری ڕاستی و چاونەترسی، هەقپەروەری و خۆ ڕاگری، چاکەکاری و مەردایەتی... فێری گەلێك هەڵوێستی جوان و ئاکاری بەرز دەبن.

لەلام ڕونە ئێوەی خۆشەویست لەمێژە تامەزرۆی پەرتوکێکن کە بەزمانێکی سادە و ساکاری منداڵانەوە ژیانی پێغەمبەرانتان بۆ بگێڕێتەوە، دەزانم کە ئەم پەرتوکە دەخوێننەوە دڵخۆش دەبن و دەڵێن: گەورەکان.! دەی زوکەن شتی دیشمان بۆ بنوسن.

**ئارامی گەلاڵی**

٢٠٠١/٨/٢٣

# وتەیەك بە پێنوسی توێژەر و بانگخوازی ئیسلامی سەید قوتب

من نوسینەکانی خاوەنی ئەم نامیلکەیە (سەید ئەبولحەسەنی نەدوی)م خوێندۆتەوە و ڕوبەڕوش خۆیم دیوە و ناسیومە، پیاوێکە خێوی دڵ و ئاوەزێکی موسڵمانانەیە، بە ئیسلام و بۆ ئیسلام و بە تێگەیشتنێکی چاکی ئیسلامیانەوە دەژی.

ئەم وتانەی کە وا لەم پێشەکیەدا بۆ ئەم نامیلکەیەی دەنوسم و تۆماریان دەکەم گەواهیدانێکە لە پێناو خواوە دەیدەم.

بەسەرهاتی پێغەمبەران بۆ منداڵان ـ هەرچەندە قەبارەیەکی بچوکی هەیە بەڵام- کارێکی بەرێز و شایستەیە، ئەم کارەش دەخرێتە سەر کارەکانی تری سەید ئەبولحەسەنی نەدوی و برا بەڕێزەکانی تر کە لە بازنەی بانگەوازی ئیسلامیدا کار دەکەن. منداڵان لە گەوران ئاتاجترن کە ئیسلامیان بە پاك و بێگەردی پێڕاگەیەنرێ، منداڵان پتر پێویستیان بەم خۆراکە هەیە تا ئەگەر جحێڵ بون تاموچێژی بڕوایان لە دەرون و، ڕوناکی بڕوایان لە دڵ دابێ و گەشایی بڕوا لەگەڵ ڕوحیان تێکەڵ بێ. بێگومان چیرۆك و بەسەرهاتیش لە بابەتە هەرە لە پێشەوەکانە، کە دڵی بێگەردی منداڵانی بۆ واڵا بێ.

ئەم نامیلکەیە- ئەگەرچی بۆ منداڵان نوسراوە- بەڵام پێموایە زۆرینەی گەورەکانیش پێویستیان بە خوێندنەوەی هەیە، چونکە گەلێ کەس لە میانەی خوێندندا لەبەر ئەوەی ئیستعمار و خاچگەرایی لەسەر پرۆگرامی خوێندن

باڵادەست بونە، بۆیان نەرەخساوە لە بەسەرهاتەکانی قورئانی پیرۆز و مەبەستە قوڵەکانیان، لە کەشوهەوا بڕوائامێز و پەروەردە ئامێز و کاریگەرەکانیان شارەزا بن، کە لەم نامیلکەیەدا ڕانوێنراوە.

گەلێ پەرتوکی منداڵانم خوێندۆتەوە-کە بەسەرهاتی پێغەمبەران درود و سلاوی خوایان لێبێ بەشێك بوە لە خوێندنەوەکەمدا- هەروەها لە دانانی زنجیرەی(القصص الديني للأطفال) لە میسر، بەشداریم کردوە کە بەسەرهاتەکانی ئەم زنجیرەیەش لە قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراون. بەڵام بێئەوەی مەبەستم دڵڕازیکردنی کەس بێ گەواهی دەدەم و دەڵێم: کارەکەی سەید ئەبولحەسەنی نەدوی لە هەمو ئەم کارانە کامڵترە، ئەویش لەبەر ئەوەی گەلێك ئامۆژگاری ناسك و رونکردنەوەی مەبەستی تێدایە کە مەبەستی بەسەرهاتەکە و ڕوداو و هەڵوێستەکانی بەسەرهاتەکە وەدەردەخەن هەروەها گەلێك لێدوانی لە ئامێزی بەسەرهاتەکان تۆمار کردوە کە ئەگەر لە دڵی منداڵان یان لە دڵی گەوران سەقامگیر بن ئەوا گەلێك هەقیقەتی بڕوا ئامێزی ترسناك پەخش دەکەن.

خوا پاداشتی چاکەی سەید ئەبولحەسەن بداتەوە و سەرکەوتوتری بکات، خوا بیکاتە مایەی ڕێنوێنکردنی ئەو وەچە[1] تازەیەی کە لە هەمو لایەکەوە رەشەبا و گەردەلول لێیان هەڵکردون و درك و داڵیان دەخرێتە سەر ڕێگا و تاریکیان بەسەردا رادەشکێ، ئەو وەچە تازەیەی کە تا بڵێی پێویستیان بە ڕوناکی و چاودێری هەیە، لە چاودێریەکەش پێویستیان بە دڵسۆزییە. سەرکەوتنیش لە دەستی خوا دایە.

---

(١) وەچە: نەوە.

# پێشەکی

**برازای[١] ئازیزم!**

دیارە زۆر حەزت لە چیرۆك و بەسەرهاتە، هەڵبەت ئاوزاکانیشت هەر وەك تۆ وانە. دەبینم پڕ بە تاسە و ئارەزوتەوە گوێ بۆ چیرۆکان رادەدێری و دەیانخوێنیەوە، بەڵام بەداخەوە کە دەتبینم هەر تەنها بە خوێندنەوەی چیرۆکی سەگ و پشیلە و گورگ و شێر و ورچ و مەیمون خەریکی، دەزانم ناچاریشی هەر دەبێ ئەم جۆرە چیرۆکانە بخوێنیەوە چونکە چاپ نەکراون و وەدەستت ناکەون. بێگومان سوچ و ئۆباڵ لە ئەستۆی ئێمە دایە.

دیارە دەستت پێکردوە فێری زمانی عەرەبی بی کە زمانی قورئان و پێغەمبەرو ئاینەکەتە، دەبینم گەلێکی بۆ تامەزرۆی و گەرەکتە بیتوێژیەوە. بەڵام من شەرم لە خۆم دەکەمەوە کە لە چیرۆکی ئاژەڵان و ئەفسانە و قسەی پڕوپوچ بترازێ هیچ جۆرە چیرۆکێکی تری عەرەبی نادۆزیەوە کە لەگەڵ تەمەنەکەت بگونجێ.

بۆیە وام بە باش زانی هەم بۆ تۆ و هەم بۆ منداڵە موسڵمانەکانیش دەست بکەم بە نوسینی بەسەرهاتی پێغەمبەران (سڵاوی خوایان لێبێ)، شێوازەکەشی بە جۆرێکی وا بێ کە لەگەڵ تەمەن و ئارەزوتان بگونجێ. جا

---

(١) برازای نوسەر ناوی موحەممەدی کوڕی دکتۆر عبدالعلی ئەلحەسەنیە، سوپاس بۆ خوا لە زمانی عەرەبیدا بلیمەتێکی چاکی لێ هەڵکەوتوە، ئێستاکەش بۆتە سەرنوسەری گۆڤاری(البعث الإسلامي). کە لە شاری لوکنهوی هیندستان دەردەچێ.

بفەرمو لەگەڵ یەکەم نوسراوی (بەسەرهاتی پێغەمبەران بۆ منداڵان) وەك دیارییەك پێشکەشت بێ.

بەسەرهاتەکانم بە نەشم و شێوازێکی منداڵانە و بە گوێرەی سروشتی منداڵان گێڕاوەتەوە، بۆیە وشە و ڕستەکانم دوبارە و سێبارە کردونەتەوە و واژە و دەستەواژەی ئاسانم بەکارهێناوە و ڕوداوەکانم بە درێژی ڕانواندون.

هیوادارم کە منداڵان یەکەمین پەرتوك لە قوتابخانەدا لەبارەی زمانی عەرەبیەوە بخوێنن و بیتوێژنەوە ئەم نامیلکەیە بێت.

پاش ئەمە - بە یارمەتی خوا - بەسەرهاتی گەلێك لە پێغەمبەرانی تر پێشکەش دەکەم.. بەسەرهاتی خۆش خۆش و بەتام وچێژ، ڕون و ڕەوان و ئاسان، سوك وساکار و جوان، لە سەروی هەموشیانەوە لە شتی پڕوپوچ و درۆ دور بێ.

موحەممەد گیان! یاخوە چاوی دایك و باوك و مامت پێ بگەشێتەوە و ئیسلامت پێ ببوژێتەوە، یاخوە بەرەکەتی بابوباپیرانت پێدا بەسەر بنەماڵە و سەرجەم موسڵمانان ببارێتەوە...

**عەلی ئەلحەسەنی نەدوی**

# بەسەرهاتی

# پێغەمبەر ئیبراهیم

سڵاوی خوای لێبێ

## ١- بت فرۆشەکە

بەر لە ڕۆژگارێکی گەلێ دێرین.

لە گوندێکدا پیاوێکی زۆر بەناوبانگ هەبو.

پیاوەکە ناوی ئازەر بو.

ئازەر بتی دەفرۆشت.

گوندەکە خانوێکی گەلێ گەورەی لێبو.

خانوەکەش گەلێ بتی جۆراوجۆری تێدابو.

خەڵکی گوندەکە سوژدەیان بۆ بتەکان دەبرد.

ئازەریش سای[١] خەڵکەکە بتەکانی دەپەرست و سوژدەی بۆ دەبردن.

## ٢- کوڕەکەی ئازەر

ئازەر کوڕێکی زۆر زیرەك و ئازای هەبو.

کوڕەکە ناوی ئیبراهیم بو.

ئیبراهیم خەڵکی دەدی سوژدەیان بۆ بتەکان دەبرد.

دەیدی خەڵك بتەکان دەپەرستن.

ئیبراهیم دەیزانی بتەکان لە بەرد دروستکراون.

---

(١) سای: وەکو

دەیزانی بتەکان نادوێن و نابیستن.

دەیزانی بتەکان زیان و قازانج نابەخشن.

دەیدی مێش و مەگەز لەسەر بتەکان هەڵدەنیشن کەچی ناتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن.

دەیدی مشك و مێرو خواردنی بتەکان دەخۆن کەچی ناتوانن دەریان بکەن.

ئیبراهیم لەبەر دڵی خۆیەوە دەیگوت:

بۆچی خەڵك سوژدە بۆ بتان دەبەن؟

ئیبراهیم لەبەر دڵی خۆیەوە دەیپرسی:

بۆچی خەڵك لە بتان دەپاڕێنەوە؟

## ٣- ئامۆژگاریەکەی ئیبراهیم

ئیبراهیم بە باوکی دەگوت:

- بابە گیان! بۆچی ئەم بتانە دەپەرستی؟
- بابەگیان! بۆچی سوژدە بۆ ئەم بتانە دەبەی
- بابەگیان! بۆچی لەم بتانە دەپاڕییەوە؟
- خۆ ئەم بتانە نادوێن و نابیستن!
- خۆ ئەم بتانە زیان و قازانجیان نیە!
- ئاخر لەبەرچی نان و ئاویان بۆ دادەنێن؟
- خۆ ئەم بتانە ناخۆن و ناخۆنەوە!

بەڵام ئازەر لەم وتانە نەدەگەیشت و تورە دەبو.

ئیبراهیم ئامۆژگاری خەڵکەکەشی دەکرد و دەیگوت:

- واز لە بتپەرستی بێنن.

بەڵام خەڵکەکە نەدەفامین و تورە دەبون.

ئیبراهیم گوتی:

- کەواتە هەرکاتێ خەڵك لە گوند بچنە دەرەوە ئەوا بتەکان دەشکێنم، ئەوسا خەڵکەکە تێدەگەن کە ئەم بتانە هیچیان لەدەست نایە.

## ٤- ئیبراهیم بتەکان دەشکێنێ

جەژن هات و خەڵکی گوندی دڵخۆش و شاد بون.

خەڵکەکە بۆ جەژن و شادی لە گوند چونە دەرێ.

منداڵەکانیشان لەگەڵ خۆ برد.

باوکی ئیبراهیمیش لە گوند دەرچو.

بە ئیبراهیمی گوت:

- ئەتۆش لەگەڵمان دێی بڕۆین؟

ئیبراهیم گوتی:

نەخێر.. من نەخۆشم!

خەڵکەکە لە گوندی چونە دەرێ تەنها ئیبراهیم نەبێ.

تەنها ئیبراهیم لە ماڵێ مایەوە.

پاشان ئیبراهیم چوە لای بتەکان و پێیگوتن:

- دەی پێم بڵێن دەتوانن بدوێن؟

- دەتوانن گوێتان لێبێ؟

- ئەوەتە نان و ئاو...! دەتوانن بیخۆن؟ دەتوانن بیخۆنەوە؟

بتەکان بێدەنگ بون و متەقیان لە دەم دەرنەهات.

چونکە بتەکان لە بەرد دروستکرابون، بەردیش ناتوانێ بدوێ.

ئیبراهیم پێیگوتن: چیتانە بۆ قسە ناکەن؟

بتەکان هەر بێدەنگ بون و قسەیان نەکرد.

ئەوجا ئیبراهیم توڕە بو و تەورەکەی گرتە دەست.

ئیبراهیم بتەکانی دایە بەر تەوران و گشتی شکاندن.

تەنها بتە هەرەگەورەکەی هێشتەوە و تەورەکەی بە گەردەنیەوە هەڵواسی.

## ٥- کێ ئەم کارەی کردوە؟

خەڵکەکە گەڕانەوە و سەردانێکی خانوی بتەکانیان کرد.

خەڵکەکە ویستیان بە بۆنەی ڕۆژی جەژنەوە سوژدە بۆ بتەکان ببەن.

بەڵام خەڵکەکە سەریان سوڕما و واقیان وڕما.

خەڵکەکە هەناسەیەکی ساردیان هەڵکێشا و توڕەبون.

گوتیان: کێ وای لە خواکانمان کردوە؟

هەندێك گوتیان: گوێمان لـێبو گەنجێك کەناوی ئیبراهیمە بە خـراپ باسـی دەکردن.

گوتیان: ئیبراهیم! ئەتۆ وات لە خواکانمان کردوە؟

گوتی: بەڵکو بتی هەرەگەورە ئەم کارەی کردوە.

دە لە بتەکان بپرسن.. ئەگەر بتوانن وەڵامتان بدەنەوە!

خەڵکەکە دەیانزانی بتەکان لە بەرد دروستکراون.

دەیانزانی بەرد نە دەدوێ و نەدەبیستێ.

دەیانزانی بتە هەرەگەورەکەش لە بەرد دروستکراوە.

ناتوانێ بڕوات و بجولێ، ناتوانێ بتەکانی تر بشکێنێ.

بۆیە بە ئیبراهیمیان گوت:

- تۆ چاك دەزانی ئەم بتانە ناتوانن بدوێن.

ئیبراهیم گوتی:

- کەواتە چۆن ئەم بتانە دەپەرستن کە ناتوانن زیان و قازانج ببەخشن؟

- چۆن ئەم بتانە دەپەرستن کە ناتوانن بدوێن و ببیستن؟

- بۆ تێناگەن؟ بۆ بیرناکەنەوە؟

خەڵکەکە بێدەنگ بون و شەرمیان لە خۆ کردەوە.

# ٦-ئاگرێکی سارد

خەڵکەکە کۆبونەوە و گوتیان: تەگبیر چیە، چ بکەین؟

ئەوا ئیبراهیم بتەکانی شکاندوە و خواکانی ڕیسواکردوە!

خەڵکەکە پرسیاریان کرد:

سزای ئیبراهیم چیە؟ چۆن تۆڵە لە ئیبراهیم وەرگرینەوە؟

وەڵام بەم جۆرە درایەوە:

بیسوتێنن و خواکانی خۆتان سەر بخەن.

ئینجا ئاگرێکی گەورەیان هەڵگیرساند و ئیبراهیمیان هەڵدایە ناوی.

بەڵام خوای گەورە فریای ئیبراهیم کەوت و بە ئاگرەکەی گوت:

ئەی ئاگر! سارد و بێزیان بە بۆ ئیبراهیم.

ئاگرەکەش ئیبراهیمی نەسوتاند و سارد و بێزیان بو.

خەڵکەکە دیتیان ئاگرەکە زیان بە ئیبراهیم ناگەیەنێ.

خەڵکەکە دیتیان ئیبراهیم دڵی خۆشە،

ئیبراهیم ساغ و سەلامەتە!

خەڵکەکە سەرسام بون و واقیان وڕما.

## ٧- کێ خوای منە؟

شەوێکیان ئیبراهیم ئەستێرەیەکی بینی، گوتی: ئەمە خوای منە.

بەڵام کە ئەستێرەکە بزر[1] بو، ئیبراهیم گوتی: نا! ئەمە خوای من نیە!

ئەمجارە ئیبراهیم مانگی بینی و گوتی: ئەمە خوای منە.

بەڵام کە مانگ ون بو، ئیبراهیم گوتی: نا! ئەمەش خوای من نیە!

ئەمجارە کە ڕۆژ دەرکەوت، ئیبراهیم گوتی: ئا ئەمە خوای منە، ئەمە لە گشتیان گەورەترە.

بەڵام کە شەو داهات و ڕۆژ بزر بو، ئیبراهیم گوتی: نا! ئەمەش خوای من نەبو.

خوا هەر زندوە و نامرێ.

خوا دەمێنێ و لەناوناچێ.

خوا بەهێزە و ژێر ناکەوێ.

بەڵام ئەستێرە بێهێزە و سبەینەی بەسەر زاڵ دەبێ.

مانگ بێهێزە و ڕۆژی بەسەر زاڵ دەبێ.

ڕۆژ بێهێزە و شەوی بەسەر زاڵ دەبێ.. هەوری بەسەر زاڵ دەبێ.

ئەستێرە سەرم ناخا، چونکە بێهێزە

مانگ سەرم ناخا، چونکە بێهێزە.

ڕۆژ سەرم ناخا، چونکە بێهێزە.

---

(١) بزر: ون

بەڵام خوا سەرم دەخا.

چونکە خوا هەمیشە زندوە و هەرگیز نامرێ.

هەمیشە دەمێنێ و لەناو ناچێ.

هەمیشە بەهێزە و ژێر ناکەوێ.

## ٨- خوا پەروەردگاری منە

ئیبراهیم زانی خوا پەروەردگاریەتی.

چونکە خوا هەمیشە زندوە و نامرێ.

خوا دەمێنێ و لەناو ناچێ.

خوا بەهێزە و ژێر ناکەوێ.

ئیبراهیم زانی خوا پەروەردگاری ئەستێرانە!

خوا پەروەردگاری مانگە!

خوا پەروەردگاری ڕۆژە!

خوا پەروەردگاری بونەوەرانە!

خوا ڕێی ڕاستی بە ئیبراهیم نیشان دا و کردیە پێغەمبەر و ئازیزی[١] خۆی.

خوا فەرمانی بە ئیبراهیم کرد بانگی گەلەکەی بکا بۆ ئەوەی خوا بپەرستن و واز لە پەرستنی بتان بێنن.

---

(١) ئازیز: زۆر خۆشەویست

## ٩- بانگەوازەکەی ئیبراهیم

ئیبراهیم بانگی گەلەکەی کرد خوا بپەرستن و واز لە پەرستنی بتان بێنن.

ئیبراهیم بە گەلەکەی گوت: چ دەپەرستن؟

گوتیان: بت دەپەرستین.

ئیبراهیم گوتی:

- کە گاسیان[1] دەکەن گوێبیستتان دەبن؟

- سود و زەرەرتان[2] پێدەبەخشن؟

گوتیان: نەخێر، بەڵام باب و باپیرانمان پەرستویانن بۆیە ئێمەش دەیانپەرستین.

ئیبراهیم گوتی: دەنا بزانن من ئەم بتانە ناپەرستم.

من دوژمنی ئەم بتانەم.

من خوای گشت بونەوەر دەپەرستم.

ئەو خوایە دەپەرستم کە منی دروست کردوە و ڕێی ڕاستم نیشان دەدا.

کە نان و ئاوم پێدەبەخشێ.

کە ئەگەر نەخۆش کەوتم چاکم دەکاتەوە.

کە دەمرێنێ و پاشان زندوم دەکاتەوە.

---

(١) گاسکردن: بانگکردن.

(٢) زەرەر: زیان.

بەڵام بتەکان هیچ دروست ناکەن و ڕێی ڕاست بە کەس نیشان نادەن.

نان و ئاو بە کەس نابەخشن.

ئەگەر یەکێ نەخۆش کەوێ چاکی ناکەنەوە.

کەس نامرێنن و ناژیێننەوە.

## ١٠- لەبەردەم پاشادا

لە شاردا پاشایەکی بە زەبروزەنگ و ستەمکار هەبو.

خەڵك سوژدەیان بۆ پاشا دەبرد.

پاشا بیستبوی کە ئیبراهیمێ هەیە تەنها بۆ خوا سوژدە دەبا.

سوژدە بۆ هیچ کەسێکی تر نابا.

پاشا توڕە بو و داوای کرد ئیبراهیمی بۆ بێنن.

ئیبراهیم هاتە لای پاشا، ئیبراهیم جگە لە خوا لە هیچ کەسێکیتر ناترسێ.

پاشا گوتی: ئەی ئیبراهیم کێ پەروەردگاری تۆیە؟

ئیبراهیم گوتی: خوا پەروەردگاری منە!

پاشا گوتی: خوا کێیە ئەی ئیبراهیم؟

ئیبراهیم گوتی: خوا ئەو خوایەیە کە دەمرێنێ و دەژیێنێ.

پاشا گوتی: منیش دەمرێنم و دەژیێنم.

پاشا پیاوێکی هێنا کوشتی.

پیاوێکیشی هێنا نەیکوشت و ئازادی کرد.

پاشا گوتی: ئەوەتا منیش دەمرێنم و دەژیێنم.

پیاوێکم کوشت و پیاوێکیشم ئازاد کرد.

پاشا پیاوێکی گەلێك گەوج[1] و گەمژە بو.

هاویەشپەرستەکان هەمو ئاوا گەوج و گەمژەن.

ئیبراهیم ویستی پاشا و گەلەکەی تێبگەیەنێ.

ئیبراهیم بە پاشای گوت: خوا ڕۆژ لە ڕۆژهەلاتەوە هەڵدێنێ، دەی تۆ لە ڕۆژ ئاواوە هەڵیبێنە.

پاشا بێدەنگ بو و لە ڕو داما.

پاشا شەرمی لە خۆی کردەوە و هیچ وەلامێکی پێ نەدۆزرایەوە.

## ١١- بانگکردنی باوکی

ئیبراهیم ویستی باوکیشی بخاتە سەر ڕێی ڕاستی خواپەرستی.

بە باوکی گوت:

- بابەگیان بۆچی شتێ دەپەرستی کە هیچ نابینێ و نابیستێ؟
- بۆچی شتێ دەپەرستی کە سود و زیان نابەخشێ؟
- بابە گیان! شەیتان مەپەرستە.
- بابەگیان! وەرە خوای میهرەبان بپەرستە.

---

(١) گەوج: بێعەقڵ.

باوکی ئیبراهیم تورە بو و گوتی:

وازم لـێ بێنە و قسەی وام لەگەڵ مەکە، ئەگەرنا ئازارت دەدەم.

ئیبراهیم پیاوێکی دڵنـەرم بـو، بۆیـە بـە بـاوکی گـوت: سـەلامەتیت بـۆ دەخوازم، من ئێرە بە جێ دێڵم و کۆچ دەکەم، من تـەنها خـوای پـەروەردگارم دەپەرستم.

ئیبراهیم هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و ویستی بەرەو وڵاتێکی تـر کـۆچ بکا، تا لەوێدا ئازادانە پەروەردگاری بپەرستێ و خەڵك بۆ پەرستنی خوا بانگ بکا.

## ١٢- بەرەو مەککە

گەلەکەی ئیبراهیم تورە بون، پاشا تورە بو، باوکی ئیبراهیمیش تورە بو.

ئیبراهیم ویستی بەرەو وڵاتێکی تر کـۆچ بکـا تـا لەوێـدا بـە سەربەسـتی پەروەردگاری بپەرستێ و خەڵك بۆ پەرستنی خوا بانگ بکا.

ئیبراهیم خواحافیزی لە باوکی کرد و وڵاتەکەی خۆی بەجێهێشت.

ئیبراهیم بەرەو مەککە کەوتە ڕێ و هاجەری خێزانیشی لەگەڵ خۆی برد.

مەککە گژوگیا و دار و درەختی لـێ نەڕوا بو.

مەککە هیچ بیر و ڕوبارێکی لـێنەبو.

مەککە هیچ گیانەوەر و مرۆڤێکی لـێنەبو.

ئیبراهیم گەیشتە مەککە و لەوێ دابەزی.

ئیبراهیم هاجەری خێزانی و ئیسماعیلی کوڕی لەوێدا بەجێهێشت.

ئیبراهیم کە دەیویست بڕوا، هاجەری خێزانی پێیگوت:

گەورەم بۆ کوێ دەچی؟ لێرەم بەجێ دێڵی؟

کە نە ئاوی لێیە و نە نان!

دیارە خوا فەرمانی پێکردوی؟

ئیبراهیم گوتی: بەڵێ خوا فەرمانی پێکردوم.

هاجەر گوتی: کەواتە خوا وێڵمان[1] ناکا.

## ١٣- بیری زەمزەم

جارێکیان ئیسماعیل تێنوی بو، دایکی ویستی ئاوی بداتێ، بەڵام کوانێ ئاو؟ خۆ مەککە بیری لێ نیە، خۆ مەککە ڕوباری لێ نیە! هاجەر بە دوی ئاودا دەگەڕا، بە تەنگەتاویەوە لە (صەفا)وە بەرەو (مەروە)و لە (مەروە)وە بەرەو (صەفا) دەهات و دەچو.

خوا فریای هاجەر و ئیسماعیل کەوت و ئاوی بۆ پەیداکردن. ئاو لە زەوی هەڵقوڵا و هاجەر و ئیسماعیل تێریان لێ خواردەوە.

ئاوەکە وەك خۆی مایەوە و پاشان بو بە بیری زەمزەم، خوا بەرەکەتی خستە زەمزەم و ئاوەکەی وشکی نەکرد.

ئەمەیە ئەو بیرەی کە خەڵك لە وەرزی حەجدا لێی دەخۆنەوە و کە بۆ وڵاتی خۆشیان دەگەڕێنەوە هەندێ ئاوی لێ دێننەوە..

ئەرێ تۆ ئاوی زەمزەمت خواردۆتەوە؟

---

(١) وێڵ: ڕێلەبەر بزربوو.

## ١٤- خەونەکەی ئیبراهیم

ئیبراهیم دوای ماوەیەك بۆ مەککە گەڕایەوە.

لەگەڵ ئیسماعیل و هاجەر بەدیداری یەکتر شادبونەوە.

ئیبراهیم گەلێك دڵی بە ئیسماعیلی کوڕی خۆش بو.

ئیسماعیل منداڵێکی بچوك بو، دەچوە دەرەوە و یاری دەکرد و لەگەڵ باوکیشی دەردەچو.

ئیبراهیم ئیسماعیلی زۆر خۆشدەویست.

شەوێکیان ئیبراهیم لە خەوندا بینی وا ئیسماعیل دەکوژێتەوە.[1]

ئیبراهیم پێغەمبەرێکی ڕاستگۆ بو، خەونەکەشی ڕاست بو.

ئیبراهیم ئازیزی خوا بو، بۆیە ویستی فەرمانەکەی خوا کە بەخەون پێی فەرمو بو جێبەجێ بکات.

ئیبراهیم بە ئیسماعیلی گوت:

کوڕی شیرینم! من لە خەوندا دەبینم دەتکوژمەوە، تۆ دەڵێی چی؟

ئیسماعیل گوتی:

بابەگیان خوا چ فەرمانێکی پێکردوی جێبەجێی بکە، منیش خوا پشتیوان بێ ئارام دەگرم.

ئیبراهیم چەقۆی هەڵگرت و ئیسماعیلی لەگەڵ خۆی برد.

---

(١) کوشتنەوە: سەربڕین.

ئیبراهیم ڕۆیشت تا گەیشتە ناوچەی (مینا)، لەوێدا ویستی ئیسماعیل بکوشتەوە.

ئیسماعیل لەسەر زەوی ڕاکشا.

ئیبراهیم ویستی بیکوشتەوە و چەقۆکەی لە سەر گەردنی ئیسماعیل دانا.

خوا پێی خۆشبو ببینێ ئاخۆ ئازیزەکەی فەرمانەکەی جێبەجێ دەکا، ئاخۆ خوای خۆشتر دەوێ یان کوڕەکەی.

ئیبراهیم لە تاقیکردنەوەکەدا سەرکەوت.

خوای گەورە بەرانێکی ناو بەهەشتی بە جبریلدا بۆ هەنارد(١) و پێی فەرمو ئەم بەرانە بکوژەوە و ئیسماعیل مەکوژەوە.

خوای گەورە کارەکەی ئیبراهیمی لەلادا خۆشەویست بو، بۆیە فەرمانی بە موسڵمانان کردوە لە جەژنانی قوربانێدا قوربانی بکوژنەوە.

درود و سلاو بۆ ئیبراهیمی ئازیز.

درود و سلاو بۆ ئیسماعیلی کوڕی.

## ١٥- کەعبە

ئیبراهیم دوبارە ئەوێندەری(٢) بەجێهێشت و دوای ماوەیەك گەڕایەوە، ئیبراهیم ویستی خانوێ بۆ خوا دروست بکا.

خانو گەلێك زۆربون بەڵام هیچ خانوێ نەبو بۆ خوا بێت و خوای تێدا

---

(١) هەناردن: ناردن، ڕەوانەکردن.

(٢) ئەوێندەر: ئەوێ، ئەو شوێن.

بپەرستری.

ئیسماعیلیش ویستی لەگەڵ باوکی پێکەوە خانوەکە دروست بکەن.

ئیبراهیم و ئیسماعیل بەردیان لە شاخەکانەوە دێنا.

ئیبراهیم بە دەستی خۆی دیواری کەعبەی دەکرد، ئیسماعیل بە دەستی خۆی دیواری کەعبەی دەکرد.

ئیبراهیم یادی خوای دەکرد و لە خوا دەپاڕایەوە.

ئیسماعیل یادی خوای دەکرد و لە خوا دەپاڕایەوە.

دەیانگوت: ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾.[1] واتە: پەروەردگارا! ئەم کارەمان لێ قبوڵ بکە، تۆ بیسەر و زانای﴾.

خوای گەورە کارەکەی لە ئیبراهیم و ئیسماعیل قبوڵ کرد و بەرەکەتی خستە کەعبەوە.

ئێمە لە هەمو نوێژەکان ڕو لە کەعبە دەکەین.

موسڵمانان بۆ حەجکردن بەرە و کەعبە دەچن، لەوێدا بەدەوری کەعبەدا دەسوڕێنەوە و لە نزیکیەوە نوێژان دەکەن.

خوا بەرەکەتی خستە کەعبە و کارەکەی ئیبراهیم و ئیسماعیلی قبوڵ کرد.

درود و سلاو بۆ ئیبراهیم.

درود و سلاو بۆ ئیسماعیل.

درود و سلاو بۆ موحەممەدی پێغەمبەرمان.

---

(١) سورەتی البقرە(١٢٧)

## ١٦- بەیتولمەقدیس

ئیبراهیم جگە لە هاجەر خێزانێکی تریشی هەبو، ناوی (سارە)بو.

ئیبراهیم کوڕێکی تری لە سارە هەبو ناوی ئیسحاق بو.

ئیبراهیم لە شام نیشتەجێ بو، ئیسحاقیش لەوێ نیشتەجێ بو.

ئیسحاق لە شامدا خانوێکی بۆ خوا دروست کرد، وەك باوك و براکەی کە لە مەککەدا خانوێکیان بۆ خوا دروست کرد.

ئەو مزگەوتەی کە ئیسحاق لە شام دروستی کرد پێی دەڵێن بەیتولمەقدیس.

هەروەها پێشی دەڵێن مزگەوتی ئەقصا، خوا بەرەکەتی خستۆتە دەوروبەری مزگەوتی ئەقصا.

خوا وەك چۆن بەرەکەتی خستە نێو نەوەکانی ئیسماعیل بە هەمان شێوە بەرەکەتی خستە نێو نەوەکانی ئیسحاقیش، گەلێك پێغەمبەر و پاشایان لێ پەیدا بو.

ئیسحاق کوڕێکی هەبو ناوی یەعقوب بو، ئەویش پێغەمبەر بو.

یەعقوب دوازدە کوڕی هەبو.

یەك لە کوڕەکان ناوی یوسفی کوڕی یەعقوب بو.

قورئانی پیرۆز بەسەرهاتێکی سەیر لەبارەی یوسف دەگێڕێتەوە.

ئیتر فەرمو ئەمەش بەسەرهاتەکەی یوسفە....

## ١- خەونێكی سەیر

یوسف كوڕێكی بچوك بو، یازده برای هەبو.

یوسف منداڵێكی جوان بو، یوسف منداڵێكی زیرەك بو.

یەعقوبی باوكی یوسفی لە هەمو كوڕەكانی خۆشتر دەویست.

شەوێكیان یوسف خەونێكی سەیر دەبینێ.

لەو خەونەدا یازده هەسارە[1] و ڕۆژ و مانگ دەبینێ كە هەمو سوژدەیان بۆ بردوە.

یوسفی منداڵ گەلێك سەری لەم خەونە سوڕما، تێنەگەیشت چۆن ئەستێرە و ڕۆژ و مانگ سوژدە دەبەن؟

یوسفی منداڵ چوە لای یەعقوبی باوكی و خەونە سەیرەكەی بۆ گێڕایەوە.

گوتی: بابە گیان! من لەخەوندا یازده هەسارە و ڕۆژ و مانگم دی سوژدەیان بۆ بردبوم.

یەعقوبی باوكی پێغەمبەر بو.

یەعقوب زۆر بە خەونەكە دڵخۆش بو.

گوتی: خوا پیرۆزت كا ئەی یوسف!، خەونەكەت وا دەگەیەنێ كە تۆ لە داهاتودا ڕێز و شكۆیەكی گەورەت دەبێ.

ئەم خەونە موژدەیە بۆ زانایی و پێغەمبەرایەتی.

---

(١) هەسارە: ئەستێرە.

خوا ئەم بەهرەیەی[1] بە ئیسحاقی باپیریشت بەخشیبو.

خوا ئەم بەهرەیەی بە ئیبراهیمی باپیریشت بەخشیبو.

دیارە بە تۆش و بە بنەماڵەی یەعقوبیشی دەبەخشێ.

یەعقوب پیرێکی بە تەمەن بو، لە سروشتی خەڵك شارەزا بو.

دەیزانی شەیتان چۆن بەسەر مرۆڤ زاڵ دەبێ.

دەیزانی شەیتان چۆن یاری بە مرۆڤ دەکا.

بۆیە گوتی: کوڕی شیرینم! ئەم خەونە بۆ براکانت مەگێڕەوە، چونکە حەسودیت پێدەبەن و لێت دەبنە دوژمن.

## ٢- حەسودیی براکان

یوسف لە دایکی خۆی برایەکی تریشی هەبو ناوی بنیامین بو.

یەعقوب ئەم دو کوڕەی زۆر زۆر خۆشدەویست، هیچ کەسێکی وەکو ئەم دو کوڕەی خۆش نەدەویست.

براکان هەمو جارێ حەسودییان بە یوسف و بە بنیامین دەبرد و توڕە دەبون، دەیانگوت:

- بۆچی باوکمان یوسف و بنیامینی لە ئێمە خۆشتر دەوێ؟

- یوسف و بنیامین بچوك و بێهێزن، بۆچی باوکمان ئەوانی خۆشدەوێ؟ بەڕاستی پێمان سەیرە!

---

(١) بەهرە: نیعمەت، بەخشش.

- خۆ ئێمە گەنجین و بەهێزیشین، ئاخر بۆچی باوکمان ئێمەی وەك یوسف و بینیامین خۆش ناوێ؟

یوسف منداڵێکی بچوك بو، خەونەکەی بۆ براکانی گێڕایەوە، براکان کاتێك خەونەکەیان گوێ لێبو تورە بون و پتر حەسودی دایگرتن.

ڕۆژێکیان براکان لەگەڵ یەکتر کۆبونەوە و گوتیان:

با یوسف بکوژین و لەکۆڵ خۆمانی بکەینەوە.

یان فرێی بدەینە جێگایەکی دور و نەیبینینەوە.

ئەوسا باوکتان بەتەواوی بۆ ئێوە دەبێت و، خۆشەویستیەکەی بەتەواوی بۆ ئێوە دەبێت.

یەکێ لە براکان گوتی:

نەخێر با فڕێ بدەینە ناو بیرێکی سەر ڕێی ڕێبواران، بەشکو چەند ڕێبوارێ بەوێدا تێپەڕن و لەگەڵ خۆیانی ببەن.

هەمو براکان گوتیان باشە وا دەکەین.

## ٣- براکان دەچنە لای یەعقوب

براکان کە لەسەر پیلانەکە ڕێککەوتن هاتنە لای یەعقوب.

یەعقوب زۆر لەوە دەترسا زەبرێ لە یوسف بوەشێنن، چونکە دەیزانی براکان حەسودی پێ دەبەن و خۆشیان ناوێ.

یەعقوب قەت یوسفی لەگەڵ براکان نەدەنارد.

یوسف هەر لەگەڵ براکەی یاری دەکرد و لە ماڵ دور نەدەکەوتەوە.

براکانیش بەمەیان دەزانی بەڵام نیازی[١] خراپیان لە دڵ گرتبو.

گوتیان: بابە گیان بۆچی یوسفمان لەگەڵ نانێری؟ لە چ دەترسێی؟ یوسف برای خۆشەویستمانە، برا بچوکمانە، هەمومان کوڕی یەك باوکین، هەمو براکان هەر پێکەوە یاری دەکەن، بۆچی ئێمەش بەیەکەوە دەرنەچین و پێکەوە یاری نەکەین؟

سبەینێ لەگەڵمانی بنێرە با ئەویش دڵی خۆش بێت و یاری بکا، ئێمەش دەیپارێزین.

یەعقوب پیاوێکی پیری بە تەمەن بو.

یەعقوب پیاوێکی بە زەین و زیرەك بو.

یەعقوب حەزی نەدەکرد یوسفی لێ دور بکەوێتەوە.

زۆر دەترسا زەبرێ لە یوسف بوەشێنن.

بە کوڕەکانی گوت: ئاخر دەترسم گورگ بیخوات و ئێوەش لێی بێئاگا بن!

گوتیان: نەخێر هەرگیز! چۆن ئێمە لەوێ بین گورگ دەیخوات؟ ئێمە گەنجین بەهێزین، چۆن دەهێڵین گورگ بیخوات؟

لە ئەنجامدا یەعقوب ڕێگەی پێدان یوسف لەگەڵ خۆ ببەن.

---

(١) نیاز: نیەت، مەبەست.

## ٤- بەرەو دارستان

براکان زۆربەمە دڵخۆش بون کە یەعقوب ڕێگەی داوە یوسف لەگەڵ خۆیان ببەن.

چونە ناو دارستانێك و یوسفیان فڕێ دایە ناو بیرێکی دارستانەکە.

بەزەییان بە یوسفی بچوك نەهاتەوە.

بەزەییان بە یەعقوبی پیر و بە تەمەن نەهاتەوە.

یوسف منداڵێکی بچوك بو، دڵی سادە و ناسك بو، بیرەکە بیرێکی قوڵ بو، بیرەکە بیرێکی تاریك بو، یوسف لەناو بیرەکەدا بە تاقی تەنیا بو.

بەڵام خوا موژدەی بە یوسف دا و پێی فەرمو:

خەمبار مەبە و مەترسە، خوا لەگەڵتە، لە داهاتودا ڕێز و شکۆیەکی گەورەت بۆ هەیە، ڕۆژێك دادێ براکان بێنە لات و تۆش پێیان بڵێیتەوە کە چیان بەسەر تۆ هێناوە.

براکان دوای ئەوەی کارەکەیان ئەنجام دا و یوسفیان هەڵدایە ناو بیرەکە پێکەوە کۆبونەوە و گوتیان:

چ بە باوکمان بڵێین؟

هەندێك گوتیان:

- باوکمان دەیگوت من دەترسم گورگ بیخوات، ئێمەش دەڵێین: بابە گیان! قسەکەت ڕاست دەرچو گورگ خواردی.

براکان لەسەر ئەم درۆیە ڕێککەوتن و گوتیان:

- بەڵێ دەڵێین بابە گیان گورگ خواردی.

هەندێك گوتیان: باشە بەڵگەمان چی بێ؟

گوتیان: بەڵگەمان خوێنە.

براکان بەرانێکیان هێنا و سەریان بڕی، کراسەکەی یوسفیان هێنا لە خوێنی بەرانەکەیان هەڵسوی.

براکان زۆر دڵخۆش بون و گوتیان:

- ئێستا باوکمان بڕوامان پێدەکا.

## ٥- لەبەردەم یەعقوبدا

براکان ئێوارێ بەگریانەوە گەڕانەوە لای باوکیان.

گوتیان: بابە گیان! لەوێ دور کەوتینەوە غارغارێنێ بکەین، یوسفیشمان لە لای شتومەکەکان بەجێهێشت، تا ئێمەش هاتینەوە گورگ یوسفی خواردبو.

کراسە خوێناویەکەشیان هێنا و گوتیان:

- ئەمەش خوێنەکەی یوسفە!

یەعقوبی باوکیان پێغەمبەر بو، پیرێکی بە تەمەن بو، لە منداڵەکانی زیرەکتر بو.

یەعقوب دەیزانی ئەگەر گورگ مرۆڤێك بخوا برینداری دەکا و کراسەکەی جیڕ بە جیڕ دەکا.

بەڵام کراسەکەی یوسف نەدڕا بو، دیاربو لە خوێن وەردرابو.

یەعقوب زانی خوێنەکە ساختەیە و خوێنی یوسفی کوڕی نیە، ڕوداوی گورگیشیان هەڵبەستوە و ڕاست نیە.

یەعقوب بە کوڕەکانی گوت:

دەزانم ڕوداوەکەتان هەڵبەستوە بەڵام ئارام دەگرم.

یەعقوب بۆ یوسف زۆر غەمبار بو بەڵام ئارامێکی جوانی گرت.

## ٦- یوسف لەناو بیردا

براکان گەڕانەوە ماڵەوە و یوسفیان لە ناو بیرەکەدا بەجێهێشت.

براکان نانیان خوارد و لەسەر جێگا نوستن.

بەڵام یوسف لەناو بیرەکە بو و خواردن و جێگای نوستنی نەبو.

براکان یوسفیان لە یاد کرد و نوستن.

بەڵام یوسف نەنوست و کەسیانی لە یاد نەکرد.

یەعقوب هەمیشە یوسفی لە یاد بو، یوسف هەمیشە یەعقوبی لە یاد بو.

یوسف لەناو بیرەکەدا مایەوە، بیرەکە بیرێکی قوڵ بو، بیرەکە لە ناو دارستان بو، دارستانەکە ترسناك و چۆل بو، کاتەکە شەو بو، شەویش تاریکەشەو بو.

## ٧- لەناو بیرەوە بۆ کۆشکی پاشا

چەند ڕێبوارێك بە دارستانەکەدا تێپەڕین.

لە ڕێگادا تینویان بو، بە دوای بیرێك گەڕان.

بیرێکیان وەبەرچاو کەوت، پیاوێکیان نارد تا ئاویان بۆ بێنێ.

پیاوەکە هاتە سەر بیرەکە و دەولکەکەی شۆڕ کردەوە.

پاشان دەولکەکەی هەڵکێشایەوە، هەستی کرد دەولکەکە قورسە!

کە دەری هێنا دەبینێ دەولکەکە کوڕێکی تێدایە!

پیاوەکە شاگەشگە بو و هاواری کرد:

- موژدە، موژدە.. ئەم کوڕە جوانەی تێدایە!

خەڵکەکە زۆر دڵخۆش بون و یوسفیان شاردەوە.

ڕێبوارەکان بەڕێ کەوتن تا گەیشتنە میسر، چونە بازاڕ و هاواریان کرد:

کێ ئەم کوڕە جوانە دەکڕێ؟ کێ ئەم کوڕە جوانە دەکڕێ؟

عەزیزی میسر بە چەند درەمێك یوسفی لێ کڕین.

بازرگانەکان یوسفیان فرۆشت بێئەوەی بزانن ئەمە یوسفە.

عەزیزی میسر یوسفی بردەوە کۆشکەکەی خۆی و بەخێزانەکەی گوت:

ئەمە یوسفە، منداڵێکی ئازا و زیرەکە، ڕێزی بگرە و خواردنی چاکی بدێ و جلی جوانی دەبەر بکە.

## ٨- ئەمەك و داوێن پاكی

(یوسف کوڕێکی زۆر جوان بو، تا گەورەتر دەبو جوانتر دەبو.

یوسف کوڕێکی ڕەوشت بەرز و بەئەمەك بو، چاکەی خەڵکی لەبەر چاو بو.

لە ماڵی عەزیزی میسردا مایەوە تا گەورە بو، تا بوە گەنجێکی زۆر جوان، تا بوە گەنجێکی هۆشیار و تێگەیشتو). [١]

خێزانی عەزیز خۆشەویستی یوسفی چوە دڵی و بۆ یوسف شێت و شەیدا بو،

---

(١) لێرەدا زۆرم بە پێویست زانیوە کە ئەم چەند ڕستەیە زیاد بکەم هەر چەندە لە عەرەبیەکەدا نیە...-وەرگێڕ-

داوای لە یوسف کرد کاری خراپی لەگەڵ بکا.

بەڵام یوسف داواکەی بە توندی ڕەت کردەوە و گوتی:

هەرگیز کاری وات لەگەڵ ناکەم، ناپاکی لەگەڵ مێردەکەت ناکەم، مێردەکەت گەورەی منە و گەلێ چاکەی لەگەڵ کردوم و، ڕێزێکی زۆری لێناوم، من لە خوا دەترسم و هەرگیز کاری وا ناکەم.

خێزانی عەزیز لە یوسف توڕە بو، چو بە مێردەکەی گوت:

- پیاوەکە! یوسف دەیوست کاری خراپم لەگەڵ بکا.

عەزیزی میسر زانی خێزانەکەی درۆ دەکا.

زانی یوسف داوێنپاکە و ناپاکی لەگەڵ ناکا.

بەخێزانەکەی گوت:

- نەخێر تۆ تاوانباری، تۆ ویستوتە کاری خراپی لەگەڵ بکەی.

جوانیەکەی یوسف لە میسردا بە هەزار ئاوازە دەنگی دایەوە، ئەگەر یەکێ بیدیبایە دەیگوت: بڕوا ناکەم ئەمە مرۆڤ بێ، من دڵنیام فریشتەیە.

خێزانەکەی عەزیزی میسر پتر لە یوسف توڕە بو، بە یوسفی گوت:

ئەگەر ئەم کارە خراپەم لەگەڵ نەکەی دەتخەمە بەندیخانەوە.

یوسف گوتی: بەندیخانەم لەم کارە پێخۆشترە.

دوای چەند ڕۆژێ عەزیزی میسر وای پێ باشتر بو یوسف بخاتە بەندیخانەوە.

عەزیزی میسر دەیزانی یوسف داوێنپاکە و بێتاوانە.

یوسف چوە بەندیخانە.

## ٩- ئامۆژگاریەکەی ناو بەندیخانە

یوسف چوە بەندیخانە.

هەمو بەندکراوەکان زانییان یوسف گەنجێکی بەڕێز و مەردانەیە.

یوسف خاوەن زانستێکی زۆر مەزنە.

یوسف دڵێکی زۆر بە بەزەیی لە سینەیە.[١]

بەندکراوەکان یوسفیان خۆشویست و ڕێزیان لێنا.

خەڵکی نێو بەندیخانەکە بە هاتنی یوسف دڵخۆش بون و زۆر بە گەورەیان دادەنا.

لەگەڵ یوسف دو کەسی تریش بەند کران.

هەردوکیان خەونیان دی و خەونەکانیان بۆ یوسف گێڕایەوە.

یەکێکیان گوتی:

- من لەخەونەکەمدا عەرەقم[٢] دروست دەکرد.

ئەوەی تر گوتی:

- منیش لە خەونەکەمدا بینیم نانم لەسەر سەرم هەڵگرتبو و باڵندە لێیان دەخوارد.

داوایان لە یوسف کرد واتای خەونەکانیان بۆ لێکداتەوە.

یوسف لە لێکدانەوەی خەونان زانا بو.

---

(١) سینە: سینگ.

(٢) عەرەق: مەی.

یوسف پێغەمبەرێکی خوا بو.

خەڵك لەو ڕۆژگاردا خوایان نەدەپەرست.

بەڵکو بە هەوەستی خۆیان چەندین خواوەندیان دانابو.

دەیانگوت: ئەمە خواوەندی وشکانییە، ئەمە خواوەندی دەریایە، ئەمە خواوەندی بژێوییە، ئەمە خواوەندی بارانە.

یوسف هەمو ئەم گومڕابونانەی دەدی و پێدەکەنی.

یوسف هەمو ئەم گومڕابونانەی دەدی و دەگریا.

یوسف دەیویست بانگی خەڵکەکە بکات خوا بپەرستن.

خوا ویستی وابو بانگەوازەکەی یوسف لە ناو بەندیخانەدا بێ.

ئەدی نابێ بەندیانیش[1] ئامۆژگاری وەرگرن؟

ئەدی نابێ بەندیانیش میهرەبانییان لەگەڵ بکرێ؟

ئەدی بەندیانیش بەندەی خودا نین؟

ئەدی بەندیانیش ئادەمیزاد نین؟

یوسف لە بەندیخانە بو بەڵام ئازاد و ئازا و بوێر[2] بو.

یوسف هەژار بو بەڵام جوامێر و بەرچاو تێر بو.

پێغەمبەران لە هەر شوێنێ بن ڕاستی ئاشکرا دەکەن.

پێغەمبەران لە هەر ڕۆژگارێ بن خێر و خۆشی بڵاو دەکەنەوە.

---

(١) بەندی: زیندان، بەندکراو.

(٢) بوێر: بەجەرگ و چاونەترس.

## ١٠- زیرەکایەتی یوسف

یوسف لە بەردڵی خۆیەوە گوتی:

پێویستی وای کردوە ئەم دو پیاوە بێنە لای من.

ئەو کەسەی پێویستیش بێ ملکەچ و نەرم و نیانە.

ئەو کەسەی پێویستیش بێ گوێڕادێر[1] و بەرفەرمانە.

ئەگەر قسەیان بۆ بکەم هەم ئەم دو پیاوە و هەم بەندکراوەکانی تریش گوێم بۆ دەگرن.

بەڵام یوسف پەلەی نەکرد.

پێیگوتن: دانیشن، بەرلەوەی خواردنتان بۆ بێ واتای خەونەکانتان پێدەڵێم.

ئەوانیش دانیشتن و دڵنیا بون.

پاشان یوسف پێیگوتن:

من لە لێکدانەوەی واتای خەونان زانامە، ئەم زانستەش خوا فێری کردومە.

ئەوانیش دڵخۆش و دڵنیا بون.

ئا لێرەدا یوسف دەرفەتی بۆ هەڵکەوت و دەستی کرد بە ئامۆژگاری.

---

(١) گوێڕادێر: گوێبیست.

## ١١- ئامۆژگاریکردن بە یەکخوا پەرستی

یوسف گوتی: خوا فێری ئەم زانستەی کردومە.

بەڵام خوا زانستەکەی بە هەمو کەس نابەخشێ.

خوا زانستەکەی بە هاوبەشپەرست نابەخشێت.

دەزانن بۆچی خوا ئەم زانستەی فێر کردوم؟

چونکە من وازم لە ڕێبازی هاوبەشپەرستان هێناوە.

ڕێبازی باوانی خۆم گرتوە کە ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوبن.

ئێمە بەردەوامان نەزانیوە هاوبەش بۆ خودا پەیدا بکەین.

یوسف گوتی:

ئەم یەکخواپەرستیە تەنها بۆ ئێمە نیە بەڵکو بۆ گشت خەڵکیە.

ئەمە چاکەیەکە خوا بە ئێمەی بەخشیوە و بە خەڵکیشی دەبەخشێ، بەڵام زۆرینەی خەڵك سوپاسی خوا ناکەن.

یوسف لێرەدا هەڵوەستەیەکی[1] کرد و لێی پرسین:

ئێوە دەڵێن خواوەندی وشکانی و خواوەندی دەریا و خواوەندی بژێوی و خواوەندی باران.

ئێمەش دەڵێین (الله) پەروەردگاری هەمو جیهانە.

هەیاران ئەم هەمو خواوەندە پەرت و بڵاوانە چاکترن یان خوای تاك و تەنیا و بەدەسەڵات؟

کوانێ خواوەندی وشکانی؟ کوانێ خواوەندی دەریا و خواوەندی بژێوی و

---

(١) هەڵوەستە: بێدەنگبونێکی کەم.

خواوەندی باران؟

پێم بڵێن ئەم خواوەندانە چ شتێکیان لە زەویدا هێناوەتە دی؟

یان لە بەدیهێنانی ئاسمانەکاندا کەنگێ هاوبەشی خودا بون؟

سەرنج لە زەوی بدەن، سەرنج لە ئاسمان بدەن، سەرنج لە مرۆڤ بدەن.

ئەمە کارەکانی خودایە، دەسا ئێوەش نیشانم دەن غەیرە خودا چیان کردوە؟

خواوەندی وشکانی و خواوەندی دەریا و خواوەندی بژێوی و خواوەندی باران چۆنن؟

ئەم خواوەندانە خوا نین بەڵکو تەنها چەند ناوێکن کە ئێوە و باب و باپیرانتان هەڵتانبەستون.

دەسەڵات دەسەڵاتی خوایە، موڵك موڵکی خوایە، زەوی زەوی خوایە، فەرمان فەرمانی خوایە.

تەنها خوا بپەرستن، ئەمەیە ڕێبازی ڕاست و تەواو.

بەڵام زۆرینەی خەڵك ئەم ڕاستیە نازانن.

## ١٢- واتای خەونەکان

یوسف کە لە ئامۆژگاریەکەی بوەوە، واتای خەونەکەی بۆ لێکدانەوە.

گوتی: یەکێکیان دەبێتە مەیگێڕ[١]ی پاشا.

ئەوەیتریش لە خاچ دەدرێ و باڵندە سەری دەخۆن.

یوسف بە پیاوەکەی یەکەمی گوت:

(١) مەیگێڕ: عەرەقگێڕ.

- ئەگەر ئازاد کرای لەلای پاشا باسم بکە و لەیادم نەکەی.
هەردو پیاوەکەیان لە بەندیخانە بردە دەرەوە.
پیاوی یەکەمیان ئازاد کرد و بو بە مەیگێڕی پاشا.
پیاوەکەیتریش لە خاچ درا و کوژرا.
مەیگێڕەکە لە بیری چو لەلای پاشا باسی یوسف بکات.
یوسف بۆ چەند ساڵێك لە بەندیخانەدا مایەوە.

## ١٣- خەونەکەی پاشا

پاشای میسر خەونێکی سەیری دیت.
لە خەونەکەدا حەفت مانگای قەڵەوی بینی.
ئەم حەفت مانگا قەڵەوە حەفت مانگای لەڕ و لاوازیان دەخوارد.
هەروەها حەفت گوڵەگەنمی سەوز و حەفت گوڵەگەنمی وشکیشی بینی.
پاشا سەری لەم خەونە سەیرە سوڕما.
لە وەزیر و گزیرەکانی پرسی ئاخۆ ئەم خەونە چی بێ؟
ئەوانیش گوتیان: هیچ نیە گەورەم مرۆڤ لە خەودا زۆر شتی خەیاڵی دەبینێ.
بەڵام مەیگێڕەکە گوتی: نا.. هەمو خەونێك خەیاڵی نیە، من واتای خەونەکەتان بۆ لێکدەدەمەوە.
مەیگێڕەکە چوە بەندیخانە و واتای خەونەکەی پاشای لە یوسف پرسی.
یوسف چاکەخواز و مەردانە بو، بەزەیی بە دروستکراوەکانی خوا دەهاتەوە بۆیە واتای خەونەکەی بۆ لێکدانەوە.

یوسف چاکەخواز و مەردانە بو، بەرچاوتەنگ و ڕەزیل[1] نەبو، بۆیە واتای خەونەکەی ئاشکرا کرد و تەگبیریشی بۆ کردن.

یوسف گوتی: ماوەی حەفت ساڵ کشتوکاڵ بکەن، جا کە دانەوێڵەکان دەدورنەوە لە ناو گوڵەکانیان بهێڵنەوە، تەنها ئەوەندە دەربێنن کە پێویستتانە بیخۆن.

پاش ئەم حەفت ساڵە بۆ ماوەی حەفت ساڵ گرانی دادێ، ئەو دانەوێڵەیەی کە دایدەگرن لە ماوەی ئەم حەفت ساڵەدا بیخۆن، تەنها کەمێك نەبێت.

پاشان خێر و خۆشی دەگەڕێتەوە و وڵات دەبوژێتەوە.

مەیگێڕەکە گەڕایەوە لای پاشا و واتای خەونەکەی پێڕاگەیاند.

## ١٤- پاشا بە دوای یوسفدا دەنێرێ

پاشا کە گوێی لە واتا و چارەسەریەکە بو زۆر دڵخۆش و شاد بو، گوتی: کێ ئەم واتایەی لێکداوەتەوە؟

ئەم پیاوە بەڕێز و چاکەخوازە کێیە کە ئامۆژگاری کردین و چارەسەری بۆ داناوین؟

مەیگێڕەکە وەڵامی دایەوە و گوتی: گەورەم! ئەم پیاوە بەڕێز و چاکەخوازە یوسفی ڕاستگۆیە، هەر ئەویش بو پێیگوتم دەبمە مەیگێڕی پاشا.

پاشا شەیدای دیداری یوسف بو، کەسێکی بە دوای یوسفدا نارد و گوتی: بڕۆ یوسفم بۆ بێنە، دەیکەمە ڕاوێژکاری تایبەتی خۆم.

---

(١) ڕەزیل: خنس، ڕژد.

## ١٥- یوسف داوای لێکۆڵینەوە دەکات

نێردراوی پاشا چوە لای یوسف و پێیگوت: پاشا تۆی دەوێ!

یوسف ڕازی نەبو یەکسەر لە بەندیخانە بێتە دەرەوە، نەبادا خەڵك بڵێن: ئەوەتا یوسف! کە هەتا دوێنێ لە بەندیخانە بو، ناپاکی لەگەڵ عەزیزی میسردا کردبو.

یوسف دەرونبەرز و گەردەنکەش بو، یوسف زیرەك و خاوەن هۆش بو.

ئەگەر هەر پیاوێکی تر لە جێگەی یوسف لە بەندیخانەدا بوایە و نێردراوی پاشای بۆ چوبوایە.

نێردراوەکە پێی بگوتایە: پاشا بانگت دەکات و چاوەڕێتە.

پیاوەکە دەسبەجێ بە خێرایی دەڕۆیشت و لە دەرگای بەندیخانە دەچوە دەرەوە.

بەڵام یوسف پەلەی نەکرد، یوسف بە خێرایی نەچوە دەرەوە.

بەڵکو بە نێردراوی پاشای گوت:

من سۆراخم[1] دەوێ، من دەمەوێ لە کێشەکەم بکۆڵنەوە.

پاشان پاشا لە کێشەی یوسفی کۆڵیەوە.

پاشا زانی یوسف داوێنپاك و بێتاوانە.

خەڵك زانییان یوسف داوێنپاك و بێتاوانە.

بەمجۆرە یوسف بە بێتاوانی لە بەندیخانە هاتە دەرەوە.

پاشا ڕێزی یوسفی گرت و پلەی بەرز کردەوە.

---

(١) سۆراخ: لێکۆڵینەوە.

## ١٦- سەرکاری گەنجینە و بەروبومی وڵات

یوسف دەیزانی دەسپاکی لەناو خەڵکدا کەم بۆتەوە.

یوسف دەیزانی گزیکاری لەناو خەڵکدا زۆر بوە.

یوسف دەیدی خەڵك خیانەت لەگەڵ ماڵی خوا دەکەن.

دەیدی زەوی گەلێك گەنجینەی بەنرخی تێدایە بەڵام بەفیڕۆ دراون.

بەفیڕۆ دراون چونکە کاربەدەستەکان لە خوا ناترسن.

سەگەکانیان تێر و پڕن کەچی خەڵك نانیان نیە بیخۆن.

خانوەکانیان پۆشتە کراون کەچی خەڵك جلیان نیە لەبەری بکەن.

خەڵك کاتێك سود لە گەنجینە و بەروبومەکانی وڵات وەردەگرن ئەگەر کاربەدەستەکانیان چاودێریکەر و لێزان بن.

ئەگەر چاودێر بن بەڵام لێزان نەبن ئەوا نازانن گەنجینەکانی زەوی بدۆزنەوە و ناتوانن سودیان لێ وەدەست بێنن.

ئەگەر لێزان بن بەڵام چاودێر نەبن گزی[1] و دزی تێدا دەکەن..

یوسف چاودێر و لێزان بو.

یوسف نایەوێ چاو لە کاربەدەستەکان وەرگێڕێ تا بە هەوەستی خۆیان ماڵی خەڵك بدزن.

یوسف ناتوانێ بێدەنگ بێ و خەڵك لە برسان بمرێ.

یوسف شەرمی نەدەکرد ڕاستەقینە بدرکێنێ.

---

(١) گزی: خیانەت.

بۆیە بە پاشای گوت: بمکە بە سەرکاری گەنجینەو بەروبومەکانی وڵات، چونکە من چاودێری دەکەم و لێزانیشم.

بەمجۆرە یوسف بوە سەرکاری گەنجینەکانی میسر.

ئیدی خەڵك هەسانەوە و زۆر سوپاسی خوایان کرد.

## ١٧- براکانی یوسف هاتن

لە میسر و شامدا وەك یوسف هەواڵی دابو برسیەتی بڵاو ببوەوە.

خەڵکی شام گوێیان لێببو، یەعقوبیش گوێی لێبو کە لە میسردا پیاوێکی میهرەبان هەیە، لە میسردا پیاوێکی مەردانە و چاکەخواز هەیە، کە ئەویش وەزیری گەنجینەکانی میسرە.

خەڵك دەچونە لای وەزیرەکە و داوای دانەوێڵەیان لێدەکرد.

یەعقوبیش هەندێ پارەی دا کوڕەکانی و ڕەوانەی میسری کردن تابەڵکو دانەوێڵە بێنن.

بەڵام یەعقوب بنیامینی لەگەڵدا نەناردن، چونکە یەعقوب بنیامینی زۆر خۆشدەویست و حەزی نەدەکرد لێی دور بکەوێتەوە.

یەعقوب لەوە دەترسا بنیامینیش وەك یوسف بفەوتێنن.

براکانی یوسف بەرەو لای یوسف بەڕێ کەوتن، نەیاندەزانی وەزیرەکە یوسفی برا بچوکیانە.

نەیاندەزانی وەزیرەکە ئەو یوسفەیە کە لە ناو بیرەکەدا بو، وایاندەزانی یوسف مردوە.

چۆن نامرێ کە لەناو بیردا مابێتەوە، بیرەکەش بیرێکی قوڵ بێ.

بیرەکەش لە ناو دارستان بێ، دارستانەکەش چۆڵ و هۆڵ بێ!

لەشەودا بەجێیان هێشتبو، شەوەکەش زۆر تاریك بو.

براکانی یوسف گەیشتنە لای یوسف، یوسف زانی ئەمانە براکانیەتی بەلاّم ئەوان نەیانزانی ئەمە یوسفە.

ئەوان یوسفیان نەناسیەوە بەلاّم یوسف ئەوانی ناسیەوە.

یوسف زانی ئەمانە ئەو کەسانەن کە کاتی خۆی فڕێیان داوەتە ناو بیرەکە، ئەوانە ئەو کەسانەن کە ویستویانە بیکوژن بەلاّم خوا پاراستویەتی.

لەگەڵ ئەمەشدا یوسف هیچ قسەیەکی ڕەقی پێنەگوتن و ڕوشکێنی(١) نەکردن.

## ١٨- گفتوگۆی نێوان یوسف و براکانی

یوسف قسەی لەگەڵدا کردن و گوتی:

- ئێوە خەڵکی کوێن؟

گوتیان: خەڵکی کەنعانین!

گوتی: باوکتان ناوی چیە؟

گوتیان: یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم (درود و سلاّوی خوایان لێبێ)

---

(١) ڕوشکێن کردن: قسەی سارد پێگوتن.

گوتی: برای ترتان هەیە؟

گوتیان: بەڵێ برایەکی ترمان هەیە ناوی بنیامینە!

گوتی: بۆچی لەگەڵ خۆتان نەتانهێناوە؟

گوتیان: چونکە باوکمان بە تەنیا بەجێی ناهێڵێ و حەز ناکا لێی دور بکەوێتەوە.

گوتی: لەبەر چ بە تەنیا بەجێی ناهێڵێ، منداڵە؟

گوتیان: نەخێر، لەبەر ئەوەی کاتی خۆی برایەکی هەبو ناوی یوسف بو، جارێکیان بۆ سەیرانێ چوین، لەوێدا ئێمە خەریکی پێشبڕکێ بوین و یوسفیشمان لە لای شتومەکەکان بەجێهێشت، تا ئێمە هاتینەوە گورگ خواردبوی.

یوسف لە دڵی خۆی پێدەکەنی بەڵام هیچ قسەیەکی ساردی پێ نەگوتن، یوسف شەیدای بینینی بنیامینی برای بو.

خوای گەورە ویستی ئەمجارەش یەعقوب تاقی بکاتەوە.

یوسف فەرمانی کرد نانیان بدەنێ.

پاشان پێی گوتن: بڕۆن براکەی تریشتان بێنن، ئەگەرنا دانەوێڵەتان نادەمێ.

یوسف فەرمانی کرد پارە و پولەکەیان بخەنەوە ناو کەلوپەلەکانیان.

## ١٩- گفتوگۆی نێوان یەعقوب و کوڕەکانی

براکان گەڕانەوە لای باوکیان و ئەوەی ڕویدا بو بۆیان گێڕایەوە، گوتیان:

بابە! دەبێ بنیامینمان لەگەڵدا بنێری ئەگەرنا وەزیر دانەوێڵەمان ناداتێ، خەمی بنیامینیشت نەبێ ئێمە دەیپارێزین.

یەعقوب گوتی: لێتان دڵنیا نیم وەك چۆن كاتی خۆی لە یوسف لێتان دڵنیا نەبوم... ڕوداوەكەی یوسفتان لە یاد چو؟ بنیامینیش وەك یوسف دەپارێزن؟

بەڵام خۆ خوا پارێزەرە، خوا لە هەمو كەس میهرەبانترە.

براكان لەناو كەلوپەلەكاندا پارەوپولەكەیان دۆزیەوە، بە باوكیان گوت:

بەڕاستی ئەم وەزیرە پیاوێكی گەلێك بەڕێز و جوامێرە، پارەوپولەكەی بۆ گلداینەوە و هیچی نەگێڕاوەتەوە.

بابە! دە تووخوا بنیامینمان لەگەڵدا بنێرە تا بەشی ئەویش وەرگرین.

یەعقوب گوتی: تا بەڵێن بە خوا نەدەن لەگەڵ خۆتانی بێننەوە لەگەڵتانی نانێرم، ئەگەر شتێكیش ڕوی دا لە دەسەڵاتی ئێوەدا نەبو جێی گلەیی نیە.

ئەوانیش بەڵێنیان بە خوا دا بنیامین بپارێزن و لەگەڵ خۆیانی بێننەوە.

یەعقوب گوتی: خوا ئاگای لێیە چ دەڵێین.

یەعقوب بنیامینی لەگەڵدا بەڕێ كردن و گوتی:

كوڕەكانم! هەموتان لە یەك دەرگاوە مەچونە ناو شار.

لە چەند دەرگایەكی جیاوازەوە بڕۆنە ژورەوە.

## ٢٠- بنیامین لە لای یوسفدا

براكان فەرمانەكەی باوكیان جێبەجێ كرد و لە چەند دەرگایەكی جیاوازەوە چونە ژورەوە تا گەیشتنە لای یوسف.

یوسف كە بنیامینی بینی زۆر دڵخۆش بو، بنیامینی لەماڵی خۆی كردە مێوان.

لەماڵەوە خۆی بۆ بنیامین ئاشکرا کرد و پێیگوت: مـن یوسفی بـراتم.. بنیامین دڵنیا بو.

یوسف دوای ڕۆژگارێکی دور و درێژ لە دابڕان و جیابونەوە لەگەڵ بنیامین بـە دیدەنی یەکتری شاد بونەوە، یوسف دایك و باوك و ماڵێ و ڕۆژانی منـداڵیی بـە یاد هاتەوە.

یوسف ویستی بنیامینی لە لادا بهێنێتەوە، تـا هـەمو ڕۆژێ ببیبینـێ و لـە بارەی ماڵەوە پرسیاری لێبکات و بیدوێنێ.

بەڵام چۆن بتوانێ ئەم مەبەستە بێنێتە دی کە سبەینێ بنیـامین بـۆ کـەنعان بگەڕێتەوە؟

چۆن ئەم مەبەستە بێنێتە دی کە براکان بەڵێنیان بە خوا دابێ لەگەڵ خۆیانی ببەنەوە؟

یوسف چۆن دەتوانێ بەبێ هۆ بنیامین لە لای خۆیدا بەند بکات؟

ئەگەر وابێ خەڵك دەڵێن: وەزیر بـەبێ هـۆ پیـاوێکی کـەنعانی بەنـد کـردوە! بێگومان ئە مە ستەمێکی مەزنە.

بەڵام یوسف زیرەك و تێگەیشتو بو.

یوسف جامێکی بەهاداری هەبو، ئاوی تێدا دەخواردەوە، جامەکـەی خـستە ناو کەلوپەلەکەی بنیامین، پاشان کە براکان ڕۆیشتن دیدەوانێك[١] هاواری کـرد: بوەستن ئێوە دزن.

براکان گەڕانەوە و گوتیان: چتان بزر کردوە؟

---

(١) دیدەوان: چاودێر.

دیدەوان گوتی: جامی وەزیر بزر بوە، هەرکەسێکیش بەر لەوەی بیپشکنین جامە دزراوەکە بگەڕێنێتەوە یەك بارە وشتری لە دانەوێڵەی پێشکەش دەکرێ.

براکان گوتیان: سوێند بەخوا ئێمە نەهاتوین خراپە بکەین و دزیمان نەکردوە.

دیدەوان گوتی: ئەگەر درۆتان کرد و دزیبوتان سزای دزەکە چیە؟

گوتیان سزای دز ئەوەیە بەند بکرێ، ئێمە ئاوا سزای دزان دەدەین.

دیدەوانەکە دوای ئەوەی کەلوپەلی هەمویانی پشکنی جامەکەی لە ناو کەلوپەلی بنیامین دۆزیەوە.

براکان شەرمەزار بون بەڵام بەبێ شەرمی گوتیان:

ئەگەر بنیامین ئێستاکە دزی دەکا، لەپێشوشدا یوسفی برای دزی کرد.

یوسف ئەم بوختانەی گوێ لێبو بەڵام دەنگی نەکرد و توڕە نەبو، یوسف پیاوێکی بەڕێز و دڵنەرم بو.

براکان گوتیان: وەزیری بەڕێز! ئەم کوڕە باوکێکی پیری بەتەمەنی هەیە، لەبەر خاتری باوکەکەی ئازادی بکە و لە جیاتی ئەو یەکێك لە ئێمە بەند بکە، تۆ مرۆڤێکی چاکەکاری ئەم چاکەیەمان لەگەڵ بکە.

یوسف گوتی: پەنا بەخوا! ئێمە چۆن کاری وا دەکەین، ئێمە تەنها ئەو کەسە بەند دەکەین کە جامەکەمان لەلادا دۆزیوەتەوە، ئەگەر یەکێکیتر بەند بکەین واتا ستەمێکمان کردوە!

بەمجۆرە بنیامین لە لای یوسفدا مایەوە، هەردو برا بەکتر دڵخۆش و شاد بون.

یوسف لە مێژ بو بە تەنیا بو، لە مێژ بو خزم و کەسی نەدیبو.

دوای ئەم لێکدابڕانە درێژە خوا وایکرد بە بنیامین شاد بێتــەوە، چـۆن دەکـرێ لەلای خۆی نەیهێڵێتــەوە و لێبگــەڕێ بـچێتەوە! نابــێ چــەند ڕۆژێــك بیبینــێ و بەدڵخۆشی بیدوێنێ؟! جا ئەگەر برا لەلای برا بمێنێتەوە ستەمە؟! نــەخێر هــەرگیز ستەم نیە.

## ٢١- گەڕانەوە بۆ لای یەعقوب

براکان لە ڕوی یەکتر دامابون و نەیاندەزانی چۆن بگەڕێنەوە لای باوکیان؟!

براکان بیریان کردەوە چ بە باوکیان بڵێن؟!

دوێنێ بــە هــەواڵی فــەوتانی یوسـف دڵیــان تەزانــد و جــەرگیان ســوتاند و خەفەتباریان کرد، ئەمڕۆش بە هەواڵی بنیامین؟!

برا گەورەکەیان لە میسردا مایەوە و بەبراکانی تری گوت:

ئێوە بڕۆنەوە بــە بابــە بڵــێن: بابــە گیــان! کوڕەکــەت دزی کــردوە، ئێمــەش شایەتیمان نەدا مەگەر لەسەر ئەوەی کە زانیمان، ئاگاشمان لە نادیار نەبو.

یەعقوب کە ڕوداوەکەی گوێ لێبو، زانی خوا دەستی لەم کارەدا هەیە، زانــی خوا تاقیی‌دەکاتەوە.

دوێنێکە بە یوسف جەرگی سوتاوە، ئەمڕۆکەش بە بنیامین جەرگی بسوتێ؟، نــەخێر خــوا دو کارەســاتی بەســەردا ناهێنــێ، نــەخێر خــوا دوجــاران جــەرگی ناسوتێنێ.

نەخێر خوا دوجاران بە دو کوڕی وەك یوسف و بینامین جەرگی ناسوتێنێ.

خوا دەستێکی نادیاری لەم کارەدا هەیە.

خوا حیکمەتێکی شاراوەی لەم کارەدا هەیە.

خوا هەمیشە کە بەندەکانی تاقیکردۆتەوە پاشان دڵی خۆش کردون و خۆشی پێبەخشیون.

پاشان خۆ کوڕە گەورەکەشی لە میسر ماوەتەوە و نەگەڕاوەتەوە.

خۆ بۆ سێیەم جاریش جەرگی ناسوتێ! نەخێر نابێ وابێ.

لێرەدا یەعقوب دڵنیا بو و گوتی: بەشکو[1] خوا هەمویانم بۆ بگەڕێنێتەوە، خوا زانایە و کاربەجێیە.

## ٢٢- نهێنییەکە دەردەکەوێ

بەڵام یەعقوبیش مرۆڤە، لە سینەیدا دڵ هەیە نەك کوچکەبەرد.

یوسفی بە یاد هاتەوە و خەمەکەی تازە بۆوە و گوتی:

ئەی داخم بۆ یوسف.

کوڕەکانی سەرکۆنەیان کرد و گوتیان:

چیە یوسف لە یاد ناکەی؟ دەتەوێ بە خەمان خۆت بفەوتێنی؟

یەعقوب گوتی: گازندە و خەم و کەسەرم هەر بۆ خوا دەدرکێنم، ئەوەی من لەبارەی خواوە دەیزانم ئێوە نایزانن.

یەعقوب دەیزانی نائومێدی بێبڕوابونە، یەعقوب هیوایەکی زۆری بەخوا هەبو.

---

(١) بەشکو: بەڵکو، خۆزگە وادەبو.

کوڕەکانی ناردەوە میسر بەو مەبەستەی سۆراخی یوسف و بنیامینی بۆ بکەن و بەوردی بەدوایدا بگەڕێن.

یەعقوب بە کوڕەکانی گوت: نەکەن لە میهرەبانیخوا نائومێد بن.

براکان سێبارە چونەوە میسر.

چونە لای یوسف و باسی هەژاری و لێقەوماوی خۆیانیان بۆ کرد و داوای چاکەیان لێکرد.

لێرەدا خەم و خۆشەویستی لە ناخی یوسف کڵپەی کرد و یوسف چیدی خۆی نەگرت و ئۆقرەی نەما.

کوڕانی باوکم و کوڕانی پێغەمبەران سکاڵای هەژاری و لێقەوماوی خۆیان لەلای وەزیرێك دەردەبڕن!

تا کەنگێ خۆمیان بۆ ئاشکرا نەکەم؟ تا کەنگێ وا بە پەرێشانی بیانبینم؟ تا کەنگێ باوکی خۆشەویستم نەبینم؟

یوسف خۆی بۆ نەگیرا و پێیگوتن:

ئاخۆ زانیوتانە چیتان بەسەر یوسف و براکەی هێنا؟ ئێوە بەڕاستی نەزان بون.

براکان دەیانزانی جگە لە یوسف و لە خۆیان هیچ کەسێکیتر بەم نهێنیە ئاگادار نیە، بۆیە زانییان ئەمە یوسفە!

سبحان الله! یوسف زندوە؟! لەناو بیردا نەمردوە؟! لە خۆمان خەنی! یوسف وەزیری میسرە؟!

یوسف ئەمینداری گەنجینەکانی میسرە؟!

یوسف بو خواردنی داینێ؟!

براکان لەوە بێگومان بون ئەو کەسەی لەگەڵیان دەدوێ خۆیەتی، یوسفی کوڕی یەعقوبە!

گوتیان: توخوا تۆ یوسفی؟

گوتی: بەڵێ من یوسفم ئەمەش برامە، خوا چاکەی لەگەڵدا کردوین، هەرکەسێك لە خوا بترسێ و ئارام بگرێ، دیارە خوا پاداشتی چاکەکاران ون ناکات.

گوتیان: سوێند بەخوا خوا تۆی بەسەر ئێمەدا سەرخستوە، ئێمە تاوانبار بوین.

بەڵام یوسف سەرکۆنەی نەکردن، بەڵکو پێیگوتن:

خوا لێتان خۆش بێ، خوا لە هەمو کەس میهرەبانترە.

## ٢٣- یوسف بەدوای یەعقوبدا دەنێرێ

یوسف شەیدای دیدەنی[1] یەعقوب بو، چۆن شەیدای نابێ کە ئەوەندە لە مێژە لێك دابڕاون؟

مادەم نهێنیەکە ئاشکرا بو ئیتر بۆچی ئارام بگرێ؟

مادەم باوکی خواردن و خواردنەوە و خەوی لێ تاڵ بوبێ ئەو چۆن چێژ لە خواردن و خواردنەوە و خەو وەردەگرێ؟

(١) دیدەن: دیدار، دیتن.

نهێنیەکە ئاشکرا بوە، نهێنیەکە دەرکەوتوە، خوا مەبەستیەتی یەعقوب لەم پەرێشانیە رزگار بکات و چاوەکانی ڕون بکاتەوە.

یەعقوب ئەوەندە بۆ یوسف خەمی خوارد بو، ئەوەندە بۆ یوسف گریا بو هەردو چاوەکانی کوێر ببون.

یوسف بە براکانی گوت:

بڕۆن ئەم کراسەی من بۆ باوکم ببەن و بەسەر دەموچاوی دابدەن چاوەکانی چاك دەبنەوە، هەمو خزم و کەسانیش بۆ ئێرە بێنن.

## ٢٤- یەعقوب لەلای یوسفدا

کاتێك بەڕێ کەوتن و کراسەکەی یوسفیان بەرەو کەنعان دەبرد، یەعقوب هەستی بە بۆنی یوسف کرد و گوتی:

من وا بۆنی یوسف دەکەم.

کەسوکارەکەی گوتیان:

سوێند بەخوا هەر لەسەر هزرە[1] هەڵەکەی پێشتر ماوی.

بەڵام یەعقوب ڕاستی دەکرد هەڵە نەبو، کاتێك موژدەی یوسفیان پێڕاگەیاند و کراسەکەیان بەسەر دەموچاوی دادا چاوەکانی ساغ بونەوە، گوتی:

ئەدی نەمگوت ئەوەی من لەبارەی خواوە دەیزانم ئێوە نایزانن؟!

کوڕەکان گوتیان: بابە گیان! داوا لە خوا بکە لە تاوانەکەمان خۆش ببێ، ئێمە تاوانبار بوین.

---

(١) هزر: بیر، فکر.

یەعقوب گوتی: باشە، داوا لە خوا دەکەم لێتان خۆش بێ، خوا لێبوردە و میهرەبانە.

یەعقوب کە گەیشتە میسر یوسف زۆر بە گەرمی و بە دڵخۆشی پێشوازی لێکردن، باوك و کوڕ ئەوەندە دڵخۆش و شاد بون ناکرێ بە قسە باس بکرێ.

ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی خۆش و پیرۆز بو، لەسەرتاسەری میسر ناوبانگی دایەوە.

یوسف دایك و باوکی لەسەر تەخت دانا، هەمو سەری نەوازشیان بۆ یوسف دانەواند.

یوسف گوتی: ئەمە بو واتای خەونەکەی منداڵیم، وا خوا بەڕاستی گێڕا.

لە منداڵی خەونم بینی یازدە ئەستێرە و ڕۆژ و مانگ سوژدەیان بۆ بردم.

یوسف زۆر ستایشی خوای کرد، یوسف زۆر سوپاسی خوای کرد.

یەعقوب و بنەماڵەکەی بۆ ماوەی ڕۆژگارێکی دور و درێژ لە میسر مانەوە.

یەعقوب و خێزانەکەی لە میسردا کۆچی دواییان کرد و بەرەو لای خوا گەڕانەوە.

## ٢٥- کۆتایی پڕ خێر

یوسف بەهۆی ئەو مولکە زۆرەی کە لەبەر دەستیدا بو خۆی لێنەگۆڕا و لە خوا بێئاگا نەبو.

یوسف هەمیشە یادی خوای دەکرد و خوای دەپەرست و لە خوا دەترسا.

یوسف بە فەرمایشتەکانی[1] خوا حوکمی ولاتی دەگێڕا.

---

(١) فەرمایشت: فەرمان، ئەمر.

یوسف موڵك و ماڵی دنیای پێ زۆر گرنگ نەبو.

یوسف حەزی نەدەکرد وەك پاشایان بمرێ و لە رۆژی زندوبونەوە لەگەڵ پاشایان کۆبکرێتەوە.

بەڵکو حەزی دەکرد وەك بەندە خواپەرستەکان بمرێ و لەگەڵ چاکەکاران حەشر بکرێ.

یوسف لە خوا دەپاڕایەوە و دەیگوت:

خوایە! موڵك و ماڵێکی زۆرت پێداوم، واتای لێکدانەوەی خەونانت فێرکردوم، پەروەردگارا! وەدیهێنەری ئەرز و ئاسمانان! تۆ لە دنیا و لە دواییدا هەر خوای پەروەردگاری منی، بە موسڵمانێتی بمرێنە و بە چاکەکارانم بگەیەنەوە.

خوای گەورەش بە موسڵمانێتی مراندی و بە باب و باپیرەکانی گەیاند کە ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب بون، درود و سڵاوی خوا لەوان و لە پێغەمبەری خۆشمان بێ.

## ١- لە دوای ئادەمدا

خوای گەورە بەرەکەتی خستە نەوەی ئادەم و، ژن و پیاوێکی گەلێك زۆریان لێکەوتەوە، نەوەی ئادەم زۆر زۆر بون و بەسەر زەوی بڵاوبونەوە.

ئەگەر ئادەم بەخۆی بگەڕێتەوە و منداڵەکانی ببینێ نایانناسێ.

ئەگەر پێی بڵێن: باوکە ئادەم! ئەم خەڵکە هەموی نەوە و منداڵی تۆن، سەرسام دەبێ و دەڵێ: سوبحانەڵڵا! ئەم خەڵکە هەموی منداڵی منن؟! ئەم خەڵکە هەموی نەوەی منن؟!

نەوەی ئادەم زۆر گوند و شاریان دروست کرد، گەلێك خانویان بنیات نا، زەوی و زاریان دەکێڵا و دانەوێڵەیان دەچاند، بەمجۆرە بۆ خۆ دەژیان.

ئەوکات خەڵك هەمو لەسەر دینی باوکە ئادەم بون، تەنها خوایان دەپەرست و لە هاوبەشپەرستی دور بون.

خەڵك هەمو یەك نەتەوە بون، ئادەم باوکی هەمویان بو، تەنها خوایان بە پەروەردگار دادەنا.

## ٢- حەسودی شەیتان

بەڵام ئیبلیس و نەوەکانی ئیبلیس چۆن بەمە ڕازی دەبن؟

هێشتا خەڵك خوا دەپەرستن؟

هێشتا خەڵك ناکۆك نین و یەك نەتەوەن[١]؟

(١) نەتەوە: ئوممەت.

نابێ وابێ! نابێ وابێ!

نەوەکانی ئادەم بچنە بەهەشت و نەوەکانی ئیبلیسیش بچنە دۆزەخ؟ نابێ وابێ! نابێ وابێ!

ئیبلیس سوژدەی بۆ ئادەم نەبردوە بۆیە خوا دەری کردوە و نەفرەتی[1] لێکردوە.

ئەدی نابێ تۆڵە لە منداڵەکانی ئادەم بکاتەوە تا ئەوانیش بچنە دۆزەخ؟ بەڵێ تۆڵە دەکاتەوە! بەڵێ تۆڵە دەکاتەوە!

## ٣- بیرکردنەوەی شەیتان

شەیتان بیری کردەوە خەڵك بخاتە سەر بتپەرستی، تا بەلکو بچنە دۆزەخ و هەرگیز نەچنە بەهەشتەوە.

شەیتان دەیزانی خوا لە هەرچی گوناح و تاوان هەیە خۆش ببێ لە هاوبەشپەرستی خۆش نابێ.

بۆیە شەیتان ویستی خەڵك بۆ هاوبەشپەرستی بانگ بکا تا هەرگیزاو هەرگیز نەچنە بەهەشتێ.

شەیتان بیری کردەوە چ ڕێگەیەك بگرێتە بەر تا بتوانێ خەڵك لە خواپەرستیەوە بەرەو هاوبەشپەرستی بانگ بکا؟

ئەگەر بچیتە لای خەڵك و پێیان بڵێ: خەڵکینە بت بپەرستن، خوا مەپەرستن. خەڵك جوێنی پێدەدەن، لێی دەدەن، تێی هەڵدەدەن.

---

(١) نەفرەت: نەفرین، لەعنەت.

دەڵێن: پەنا بەخوا! هاوبەش بۆ خوا پەیدا بکەین؟! بتی لە بەرد بپەرستین؟! برۆ وازمان لێ بێنە، تۆ شەیتانی نەفرەت لێکراوی! تۆ شەیتانی خراپەخوازی!

## ٤- فێڵی شەیتان

بەڵام شەیتان دەرگایەکی دۆزیەوە و لەم دەرگایەوە چوە ناو مێشکی خەڵکی.

لەناو خەڵکدا چەند پیاوێك هەبون پیاوی لەخواترس بون، شەو و رۆژ هەر خوایان دەپەرست و زۆر یادی خوایان دەکردەوە.

ئەم پیاوانە خوایان خۆشدەویست، خواش ئەوانی خۆشدەویست ونزای[1] قبوڵ دەکردن.

خەڵك ئەم پیاوانەی خۆشدەویست و بە گەورەیان دادەنان.

شەیتان زۆر چاك بەمە ئاگادار بو.

ئەم پیاوانە مردن و بەرەو لای خوا گەڕانەوە.

شەیتان چوە لای خەڵکەکە و پیاوەکانی یاد خستنەوە.

گوتی: فلان و فیسار پیاو چۆن بون؟

گوتیان: سبحان الله! پیاوی لەخواترس و خواپەرست بون! ئەگەر نزایان بکردایە قبوڵ دەبو، ئەگەر داوایان لە خوا بکردایە خوا پێی دەبەخشین.

---

(١) نزا: دوعا، پاڕانەوە.

## ٥- وێنەی پیاوچاکەکان

شەیتان گوتی: ئێوە بۆیان خەمبارن؟

گوتیان: زۆر خەمبارین.

گوتی: ئێوە تامەزرۆن بۆیان؟

گوتیان: زۆر تامەزرۆین.

گوتی: مادەم وایە بۆچی هەمو ڕۆژێ تەماشایان ناکەن؟

گوتیان: چۆن دەتوانین؟ ئەوان مردون و نەماون؟!

گوتی: وێنەیان بۆ بکێشن و گشت سبەینان سەیریان بکەن.

خەڵك بە قسەکەی ئیبلیس سەرسام بون و وێنەی پیاوچاکەکانیان کێشا، هەمو ڕۆژێ سەیری وێنەکانیان دەکرد، کە وێنەکانیان دەدی پیاو چاکەکانیان بەبیر دەهاتەوە.

## ٦- لە وێنەوە بۆ پەیکەر

پاشان خەڵك بەرەبەرە وێنەکانیان کردە پەیکەر.

پەیکەرێکی گەلێ زۆریان بۆ پیاو چاکەکان داتاشی.

پەیکەرەکانیان لە ماڵ و لە مزگەوتان دادەنا.

خەڵکەکە خوایان دەپەرست و هاوبەشیان بۆ پەیدا نەدەکرد.

دەیانزانی ئەم پەیکەرانە خوا نین و پەیکەری پیاوچاکانن.

دەیـانزانی پەیکـەرەکان بـەردن و زیـان و قـازانج ناگەیـەنن و بـژێوییان پێنابەخشن.

بەڵام بۆ تەبەرروك و پیرۆزی بەکاریان دێنان و بە گەورەیان دادەنـان، چـونکە پەیکەری پیاوچاکان بون.

ئیتر ژمارەی پەیکەرەکان زۆر بون و زۆر بە گەورە سەیریان دەکـردن، هـەر پیاوچاکێك بمردبایە پەیکەرێکیان بۆ دروست دەکـرد و نـاوی پیاوچـاکەکەیان لێدەنا.

## ٧- لە پەیکەرەوە بۆ بت

ئەم چینە خەڵکە مردن.

کوڕەکان باوکی خۆیان بینیبو پەیکەرەکانیان بۆ تەبـەرروك و پـیرۆزی بـەکار دێنا.

باوکانی خۆیان بینیبو پەیکەرەکانیان بە گەورە دادەنا.

دەیاندی پەیکەرەکانیان ماچ دەکرد و دەسـتیان پـێ دادەهێنـان و دوعایـان لەلادا دەکردن.

دەیاندی سەریان بۆ دادەنواند و کڕنوشیان بۆ دەبردن.

بەڵام کوڕەکان لە باوانیان تێپەڕاند و وایان لێهـات سـوژدەیان بـۆ دەبـردن و لێیان دەپاڕانەوە و قوربانییان بۆ سەر دەبڕین.

بەمجۆرە بتەکان بون بە خواوەند، خەڵك پێشتر چۆن خوایـان دەپەرسـت وایـان لێهات بە هەمان شێوەش خواوەندەکان بپەرستن.

خواوەندەکان گەلێ زۆر بون، ئەمە ناوی وەددە و ئەوە نـاوی سـواعە، ئەمـە ناوی یەغوثە و ئەوە ناوی یەعوقە، ئەمەش ناوی نەسرە.

## ٨- تورەیی خوا

خوا گەلێك لەم خەڵکە هاوبەشپەرستە تورە بو و نەفرەتی لێکردن، چۆن خـوا لە خەڵکی تورە نەبێ و نەفرەتیان لێ نەکات؟

ئایا بۆ هاوبەشپەرستی دروستی کردون؟

ئایا بۆ هاوبەشپەرستی بژێوییان پێدەبەخشێ؟

لەسەر زەوی برۆن و بە خواش بێبڕوا بن؟!

بژێوی خوا بخۆن و هاوتاشی بۆ بڕیار دەن؟!

بەڕاستی ئەمە ستەمێکی گەورەیە! بەڕاستی ئەمە ستەمێکی گەورەیە!

خوا لە خەڵکەکە تورە بو، بارانی بـۆ نەبارانـدن، بـژێوی لێ کـەم کردنـەوە، دانەوێڵە کەم بوەوە، نەوە و منداڵ کەم بونەوە.

بەڵام خەڵك هۆشیار نەبونەوە، بەڵام خەڵك ژیوان[١] نەبونەوە.

---

(١) ژیوان: پەشیمان.

## ٩- پێغەمبەر

خوا ویستی پێغەمبەرێکیان بۆ بنێرێ تا لەگەڵیان بدوێ و ئامۆژگارییان بکات.

خوا لەگەڵ تاك بە تاکی مرۆڤان نادوێ، خوا لەگەڵ یەکە یەکەی خەڵکان نادوێ و بڵێ وا بکەن و وا مەکەن.

پاشاکان لەگەڵ یەکە یەکەی خەڵکی نادوێن.

پاشاکان ناچنە لای یەکە یەکەی خەڵك و پێیان بڵێن وا بکەن و وا مەکەن.

پاشاکان مرۆڤن وەك هەر مرۆڤێکیتر، هەمو کەسێك دەتوانێ بیانبینێ و گوێ لە وتەکانیان بگرێ.

بەڵام کەس ناتوانێ خوا ببینێ و لەگەڵی بدوێ و گوێ لە وتەکانی بگرێ.

تەنها ئەو کەسانە دەتوانن کە خوا خۆی مەبەستی بن.

بۆیە خوا ویستی پێغەمبەرێك بۆ خەڵك بنێرێ تا لەگەڵیان بدوێو ئامۆژگارییان بکات.

## ١٠- مرۆڤ یان فریشتە؟

خوا وای ویست پێغەمبەرەکە مرۆڤ بێ، یەکێك بێ لە خەڵکەکە، خەڵك بیناسن و لە وتەکانی بگەن.

ئەگەر پێغەمبەرەکە فریشتە بوایە خەڵك دەیگوت:

جیاوازیمان وەك ئاسمان و ڕیسمان وایە، ئەو فریشتە و ئێمە مرۆڤ! ئێمە نان دەخۆین و ئاو دەخۆینەوە و نەوەمان هەیە، چۆن دەتوانین خوا بپەرستین؟

بەڵام ئەگەر پێغەمبەرەکە مرۆڤ بێ دەڵێ:

منیش نان دەخۆم و ئاو دەخۆمەوە و نەوەم هەیە کەچی ئەوەتانێ دەتوانم خوا بپەرستم، دەی ئێوە بۆچی خوا ناپەرستن؟

ئەگەر پێغەمبەرەکە فریشتە بوایە خەڵك دەیگوت:

تۆ برسی و تینو نابی، تۆ نەساغ نابی و نامری بۆیە دەتوانی بەردەوام خوا بپەرستی و یادی خوا بکەی! بەڵام ئێمە مرۆڤین، تینو دەبین و برسی دەبین، نەساغ دەبین و دەمرین، چۆن دەتوانین بەردەوام خوا بپەرستین و یادی بکەین؟

بەڵام ئەگەر پێغەمبەرەکە مرۆڤ بێ دەڵێ:

منیش وەکو ئێوەم، برسی و تینو دەبم، نەساغ دەبم و دەمرم، کەچی ئەوەتانێ دەتوانم خوا بپەرستم و یادی بکەم، دەی ئێوە بۆچی خوا ناپەرستن و یادی ناکەن؟

کەواتە ئەگەر پێغەمبەرەکە مرۆڤ بێ خەڵك قسەی دەبڕێت و بڕوبیانوی نامێنێ.

## ١١- پێغەمبەر نوح

خوا وای ویست نوح بکاتە پێغەمبەر و بۆ نەتەوەکەی بنێرێ.

لە ناو نەتەوەی نوحدا گەلێك پیاوی دەوڵەمەند و سەرۆك هەبون، بەڵام خوا نوحی بۆ پەیامەکەی خۆی هەڵبژارد، کەسێکی تری هەڵنەبژراد.

خوا خۆی دەزانێ کێ پەیامەکەی هەڵدەگرێ، خوا خۆی دەزانێ کێ ڕاسپاردەکەی هەڵدەگرێ.

نوح پیاوێکی چاکەخوازو بەڕێز وجوامێر بو، نوح پیاوێکی ژیر و دڵنەرم بو، نوح پاوێکی دڵسۆز و بە بەزەیی بو، نوح پیاوێکی دەسپاك و ڕاستگۆ بو.

خوا نوحی بۆ پەیامەکەی خۆی هەڵبژارد و سروشی[1] بۆ دابەزاند و پێی فەرمو:

ئەی نوح! هەڵسە نەتەوەکەت بێدار بکەوە بەر لەوەی سزای سەختی خوایان دوچار ببێ.

ئەویش هەڵسا و بەناو نەتەوەکەیدا دەگەڕا و بە خەڵکەکەی دەگوت:

خەڵکینە! من پێغەمبەری خوام، بۆتان دڵسۆزم گوێم بۆ بگرن.

## ١٢- نەتەوەکەی چ وەڵامێکیان دایەوە؟

نوح کاتێك نەتەوەکەی بێدار دەکردەوە و دەیگوت:

خەڵکینە! من پێغەمبەری خوام، بۆتان دڵسۆزم گوێم بۆ بگرن.

هەندێ کەس دەیانگوت:

کەنگێ[2] بۆتە پێغەمبەر؟ تا دوێنێ وەك ئێمە پیاوێکی ئاسایی بو کەچی ئەمڕۆ دەڵێ پێغەمبەری خوام؟!

برادەرەکانی دەیانگوت:

لە منداڵی لەگەڵ ئێمە یاری دەکرد و هەمو ڕۆژێ لەگەڵمان دادەنیشت! کەنگێ پێغەمبەرایەتی بۆ هاتوە؟ بە شەو یان بە ڕۆژ؟!..

---

(١) سروش: نیگا، وەحی.

(٢) کەنگێ: کەی، چ کاتێ.

دەوڵەمەندە لوتبەرزەکان[1] دەیانگوت:

دیارە خوا کەسێکی تری نەبینیوە؟ دیارە هەمو خەڵك مـردون و تـەنها ئـەم هەژارەی تێدا ماوەتەوە؟!

نەفامەکان دەیانگوت:

چۆن دەڵێ پێغەمبەرم؟ خۆ نوحیش وەك ئێمە مرۆڤە!

هەندێ کەسی تر دەیانگوت:

ئەگەر خوا پێغەمبەری بناردایە فریشتەیەکی دەنـارد، لـە بـاب و باپیرانـان نەبیستوە مرۆ ڤ ببێتە پێغەمبەر!

هەندێ کەسی تریش دەیانگوت:

دیارە نوح مەبەستی لەم وتانە ئەوەیە کە ببێتە سەرۆك و دەمڕاستی خەڵکی!

## ١٣- گفتوگۆی نێوان نوح و نەتەوەکەی

خەڵك پێیانوابو بتپەرستی کارێکی ڕاست و دروستە، پێیانوابو هۆشمەندییە.

ێیانوابو ئەو کەسەی بت نەپەرستێ گومڕا و گەمژەیە.

دەیـانگوت: بـاب و باپیرانـان بتیـان دەپەرسـت، بۆچـی ئـەم کابرایـە بـت ناپەرستێ؟

نوح دەیزانی بتپەرستی گومڕا بونە، بتپەرستی گەمژەییە.

نوح دەیزانی باب و باپیران لە گومڕابون و گەمژەییدا ژیاون.

---

(١) لوتبەرز: خۆ بەگەورەزان، فیزبەرز.

ئادەم باوکی هەموان بو کەچی بتی نەدەپەرست، بەڵکو خوای دەپەرست.

نوح دەیزانی نەتەوەکەی لە گومڕابون و گەمژەیی دان چونکە بەرد دەپەرستن و ئەو خودایە ناپەرستن کە دروستی کردون.

نوح بە نێو نەتەوەکەیدا دەگەڕا و پڕ بە دەنگی خۆی هاواری دەکرد:

هۆ نەتەوەکەم! تەنها خوا بپەرستن، جگە لە خوا پەرستراوی تری بە هەقتان نیە، من دەترسم توشی سزای ڕۆژێکی سەخت بن.

کەچی پیاوماقوڵانی[1] نەتەوەکەی گوتیان:

ئەی نوح ئێمە پێمان وایە تۆ گومڕا بوی.

نوح وەڵامی دانەوە و گوتی:

نەتەوەکەم! من گومڕا نیم، من پێغەمبەرم لەلای خواوە نێردراوم، پەیامەکانی خواتان پێڕادەگەیەنم و ئامۆژگاریتان دەکەم، ئەوەی من لە بارەی خواوە دەیزانم ئێوە نایزانن.

## ١٤- زەبونەکان شوێنت کەوتون

نوح گەلێکی هەوڵ دا نەتەوەکەی بڕوای پێبێنن و خوا بپەرستن و واز لە بتپەرستی بێنن.

بەڵام نەتەوەکەی بڕوایان پێنەهێنا، تەنها چەند کەسێك بڕوایان پێهێنا کە بە بەری ڕەنجی خۆیان دەژیان و تەنها حەڵاڵیان دەخوارد.

---

(١) پیاوماقوڵ: پیاوی دیار و دەمڕاست.

بەڵام دەوڵەمەندانی نەتەوەکەی لەبەر ئەوەی خۆیان بە گەورە دەزانی ملکەچی نوح نەبون، بە ماڵ و منداڵان خەریك بون و بیریان لە ڕۆژی دوایی نەدەکردەوە.

دەیانگوت: ئێمە گەورە و دەمڕاستی خەڵکین، ئەمانە زەبون و ڕوت و برسین.

کاتێك نوح بۆ خواپەرستی بانگی دەکردن دەیانگوت:

چۆن بڕوات پێ دێنین کە زەبونەکان شوێنی تۆ کەوتون.

داوایان لە نوح کرد هەژار و ڕوت و برسیەکان دەربکات و لە خۆی بە دوریان خاتەوە.

بەڵام نوح داواکەی ڕەت کردنەوە و پێیگوتن:

من هەرگیز بڕواداران دەرناکەم، دەرگاکەی من ئاستانەی[1] پاشایان نیە، من پێغەمبەرم و لە سزای خوا بێدارتان دەکەمەوە.

نوح دەیزانی ئەم هەژار و ڕوت و برسیانە بڕواداری دڵسۆزن.

دەیزانی ئەگەر هەژارەکان دەربکات خوا لێی تورە دەبێ، کەسیش ناتوانێ لە سزای خوا ڕزگاری بکات.

لەبەر ئەوە بە نەتەوەکەی گوت:

نەتەوەکەم! ئەگەر من دەریان بکەم کەس هەیە لە سزای خوا ڕزگارم بکا؟!

---

(١) ئاستانە: دەربار و بەر دیوەخانی پاشایان.

## ١٥- بڕوبیانوی دەوڵەمەندەکان

دەوڵەمەندەکان گوتیان:

ئەو شتەی نوح بانگەوازی بۆ دەکا ڕاست نیە.

خێر و خۆشی تێدا نیە.

چونکە بە ئەزمون بۆمان رون بۆتەوە لە هەمو کارێکی خێردا هەر خۆمان دەستپێشخەر بوین.

چاکترین خواردن هەر ئێمە هەمانە، جوانترین جل هەر ئێمە لەبەرمانە، لە هەمو شتێ هەر خەڵك لە دوامانە.

ئێمە پێمانوایە هەر خێر و خۆشییەك لەم شارەدا پەیدا ببێ دەبێ بۆ ئێمە بێت و لە دەست خۆمان دەرنەچێ.

جا ئەگەر ئەم ئاینە خێر و خۆشی تێدا بوایە، دەبوایە بەرلەوەی بۆ ئەم هەژارانە بوایە بۆ ئێمە بێ.

ئەگەر ئەم ئاینە خێر و خۆشی تێدا بوایە، نەدەبوایە هەژارەکان پێشی ئێمە بڕوا بێنن.

## ١٦- بانگەوازەکەی نوح

نوح بانگی نەتەوەکەی کرد و گەلێك ئامۆژگاری کردن.

دەیگوت: نەتەوەکەم! من لە سزای سەختی خوا بێدارتان دەکەمەوە، خوا بپەرستن، لە خوا بترسن، بەگوێم بکەن، ئەگەر وابن خوا لە گوناهەکانتان دەبورێ[1] و سزاکەتان لەسەر هەڵدەگرێ، هەر کاتێکیش ئاکام(ئەجەل)ی خوا

(١) دەبورێ: خۆش دەبێ.

هات دوا ناخرێت، بریا ئەوەتان زانیبا.

خوا لێیان تورە ببو بارانی بۆ نەدەباراندن، بەرهەمی کشتوکاڵ و زگوزایان[١] کەم ببوەوە.

نوح پێی گوتن: نەتەوەکەم! ئەگەر ئێوە بڕوا بێنن خوا لێتان ڕازی دەبێ و سزاتان لەسەر هەڵدەگرێ.

بارانتان بۆ دەبارێنێ و بەرەکەت دەخاتە نەوە و بژێویتان.

نوح بانگی نەتەوەکەی دەکرد بۆ لای خوا بگەڕێنەوە.

پێی دەگوتن: دەڵێی خوا ناناسن؟ چاو هەڵبڕن سەیری نیشانە و بەڵگەکانی خوا بکەن، بیر لە ئەرز و ئاسمانان بکەنەوە، بیر لە ڕۆژ و مانگ بکەنەوە.

کێ ئاسمانەکانی دروستکردوە؟

کێ مانگی روناك و ڕۆژی گڵپەداری دروستکردوە؟

کێ ئێوەی دروستکردوە و زەوی بۆ سازاندون تا بتوانن لەسەری بژین!

بەڵام نەتەوەکەی نوح تەمبێ نەبون[٢]!

نەتەوەکەی نوح بڕوایان نەهێنا!

بەڵکو کاتێك کە پێغەمبەر نوح بۆ خواپەرستی بانگی دەکردن پەنجەیان لە گوێی خۆ دەنا!

جا ئەگەر یەکێك شت نەبیستێ چۆن تێدەگا؟

ئەگەر یەکێك نەیەوێ شت ببیستێ چۆن دەبیستێ؟

(١) زگوزا: لەدایکبونی منداڵان.

(٢) تەمبێ بون: دەست لە کاری ناڕەوا هەڵگرتن بەهۆی سزایەك.

## ١٧- نزای نوح

نوح هەوڵێکی زۆری لەگەڵ دان و ماوەی ڕۆژگارێکی درێژ بانگی کردن.

نوح ماوەی نۆ سەد و پەنجا ساڵان بۆ خواپەرستی بانگی کردن.

بەڵام نەتەوەکەی نوح بڕوایان نەهێنا.

وازیان لە بتپەرستی نەهێنا، بۆ لای خوا نەگەڕانەوە.

نوح تا کەنگێ چاوەڕێ بێ؟

تا کەنگێ خراپەکاری لەسەر روی زەوی ببینێ؟

تا کەی ببینێ بەرد بپەرسترێ؟

تاکەی ببینێ خەڵك بژێوی خوا بخۆن و بەناو خواوەندیتر بپەرستن؟

نوح چۆن لە نەتەوەکەی توڕە نابێ؟ زۆری نەرمی لەگەڵ کێشان، زۆر ئارامی لەسەر گرتن، تەنانەت کەس هێندەی نوح ئارامی نەگرتوە!

نۆسەد و پەنجا ساڵ؟!. ألله أكبر لەم ڕۆژگارە درێژە!. ألله أكبر لەم ڕۆژگارە درێژە..!

خوا سروشی بۆ نوح هەنارد، فەرموی:

جگە لەوانەی بڕوایان هێناوە کەسیتر بڕوا ناهێنێ.

نوح بۆجاری کۆتایی بانگی نەتەوەکەی کردەوە و پێیگوتن:

- وازبێنن و بگەڕێنەوە.

بەڵام نەتەوەکە ئامۆژگارییان ڕەت کردەوە و گوتیان:

- ئەی نوح گوێ بگرە! ئێمە بڕوات پێناهێنین و زۆریشت مشتومڕ[1] لەگەڵ کردوین، بڕۆ ئەگەر ڕاست دەکەی باکت[2] نەبێ با هەڕەشەکەت بێتە دی و دوچاری سزای خوا بین.

نوح لەپێناو خوا لێیان توڕە بو، گوتی:

- خوایە! بێبڕواکانی سەر زەوی لەناو ببە و کەسیان تێدا مەهێڵە.

## ١٨- کەشتی

خوا نزاکەی نوحی قبوڵ کرد و وای ویست نەتەوەکەی لە ئاوێدا بخنکێنێ.

بەڵام خوا دەیەوێ نوح و بڕوادارەکان ڕزگار بن.

خوا فەرمانی بە نوح کرد کەشتیەکی گەورە دروست بکات.

نوح دەستی کرد بە دروستکردنی کەشتیەکی گەورە.

نەتەوەکە دەیاندی نوح خەریك و سەرقاڵە[3].

گاڵتەیان پێدەکرد، دەیانگوت:

ئەی نوح ئەمە چ بەزمێکە؟ لە کەنگیوە بویە دارتاش؟

چەندمان پێگوتی لەگەڵ ئەم زەبونانە دامەنیشە، بەڵام تۆ بە گوێت نەکردین و هەر لەگەڵ دارتاش و ئاسنگەران دانیشتی تا بوی بە دارتاش!

ئەم کەشتیە لە کوێ دەڕوا ئەی نوح؟

---

(١) مشتومڕ: دەمەقاڵێ.

(٢) باك: منەت.

(٣) سەرقاڵ: مەشغول.

بەڕاستی هەمو کارەکانت سەیر و عەنتیکەن!

لەسەر لم دەڕوا یان بەسەر چیا هەڵدەگەڕێ؟

دەریا لێرە گەلێ دورە، جنۆکە هەڵیدەگرن یان گاگەل[1] ڕایدەکێشن؟

نوح گوێی لە هەمو ئەم قسانە دەبو بەڵام ئارامی دەگرت.

پێشتر قسەی ناخۆشتری بیستوە و ئارامی لەسەر گرتوە!

بەڵام جاروبار پێی دەگوتن:

ئێوە گاڵتەمان پێدەکەن بەڵام ڕۆژێك دێ گاڵتەتان پێبکەینەوە.

## ١٩- لافـــاو

سزای خوا هات، پەنا بەخوا لە سزای خوا!

ئاسمان بارانی داباراند، هەر باراندی و هەر باراندی و هەر باراندی، دەتگـوت ئاسمان بۆتە بێژینگ و ئاو ڕاناگرێ.

زەویش ئاوی هەڵقوڵاند، ئاو لافاوێکی گەورەی هەڵکرد، لە هەمو لایەکـەوە خەڵکی داگرتەوە.

خوا سروشی بۆ نوح نارد و فەرمو:

لە نەتەوە و لە خزمانت ئەوانەی بڕوایان پێهێناوی لەگەڵ خـۆت بیانبــە نـاو کەشتی.

---

(١) گاگەل: کۆمەڵێك گا.

لە گشت جۆرە گیانلەبەر و پەلەوەرێکیش نێر و مێیەك هەڵبژێرە و بیانخە ناو کەشتی.

چونکە لافاوەکە لافاوێکی گشتیە، هیچ مرۆ ـ ڤ و گیانلەبەرێك قوتار[1] ناکا.

نوح فەرمانەکەی خوای جێبەجێ کرد.

لەناو کەشتیەکەدا بڕوادارانی نەتەوەکەی و نێر و مێی گشت گیانلەبەر و پەلەوەرێکیشی لەگەڵدا بو.

کەشتیەکە بەسەر ئاو کەوت و ڕۆیشت، لافاو شەپۆلی زل و زەبەلاحی وەك شاخانی هەڵدەکرد.

نەتەوەکە دەچونە شوێنی بەرز بەرز و بەسەر گرد و تەپۆلکان هەڵدەگەڕان، لە سزای خوا هەڵدەهاتن.

بەلاّم هیچ کەس ڕزگار نابێ.

## ٢٠- کوڕەکەی نوح

نوح کوڕێکی هەبو، کوڕەکەی بێبڕوا بو، لەگەڵ بێبڕواکان دابو.

نوح کوڕەکەی بینی وا لەناو لافاو دایە، گوتی:

- کوڕم وەرە لەگەڵ ئێمە بە سواری کەشتی بە، لەگەڵ بێبڕواکان مەبە.

کوڕەکەی گوتی:

نا بابە دەچمە سەر چیا، چیا لە لافاو دەمپارێزێ.

(١) قوتار: ڕزگار، دەرباز.

نوح گوتی: نا کوڕی خۆم ئەمڕۆ کەس لە سزای خوا ڕزگار نابێ مەگەر ئەوانەی خوا میهرەبانی لەگەڵدا کردون.

لەم قسانەدا شەپۆلێك هەڵیکرد و لێکی کردن[1]، کوڕەکەی خنکا.

نوح بۆ کوڕەکەی خەفەتبار بو، چۆن خەفەتبار نەبێ! ئەدی کوڕی خۆی نییە؟

کوڕەکەی نوح ئەگەرچی لە لافاوەکەی دوێنێ رزگاری نەبو بەڵام نوح حەزی دەکرد لە ئاگری ڕۆژی دوایی ڕزگاری بێ.

ئاگر لە لافاو سەختترە، ئازاری ڕۆژی دوایی لە هی دونیا ناخۆشترە.

ئەدی خوا بەڵێنی پێنەداوە خزم و کەسی رزگار بکات؟

بەڵێ! بەڵێنی داوە و بەڵێنی خواش تەواوە.

بۆیە نوح ویستی لە خوا بپاڕێتەوە تا لە کوڕەکەی خۆش ببێ.

## ٢١- لە کەسی تۆ نیە

نوح لە خوا پاڕایەوە و گوتی:

خوایە کوڕەکەشم کەسی منە، بەڵێنی تۆ ڕاست و تەواوە، خوایە خۆت دادگەرترین فەرمانڕەوای.

بەڵام خوا تەماشای نەژاد و بنەماڵە ناکات، خوا تەماشای کردەوە دەکات.

خوا ئەو پاڕانەوەیە قبوڵ ناکا بۆ هاوبەشپەرستان بکرێ.

هاوبەشپەرست کەسی پێغەمبەر نیە ئەگەر چی کوڕیشی بێ.

---

(١) لێکی کردن: لە یەکتری دابڕاندن.

خوا نوحی لەم ڕاستیە ئاگادار کردەوە و فەرموی:

ئەی نوح ئەم کوڕە لە کەسی تۆ نیە چونکە کوڕێکی بێبڕوا بو، چاکەکار نەبو خراپەکار بو.

داوای شتێکم لێ مەکە کە زانیاریت لە بارەوە نەبێ، ئامۆژگاریت دەکەم وەك نەفامان نەبی.

نوح وریا بۆوە، بۆ لای خوا ژیوان بۆوە.

گوتی: پەروەردگار! خۆم لەوە دەپارێزم کە داوای شتێکت لێبکەم زانیاریم لە بارەوە نەبێ.

خوایە ئەگەر لێم نەبوریو میهرەبانیم لەگەڵدا نەکەی دەچمە ڕیزی دۆڕاوەکان.

## ٢٢- دوای لافاوەکە

کە مەبەستەکەی خوا هاتە دی و بێبڕواکان لە ئاودا خنکان؛ ئاسمان بارانی ڕاگرت و زەوی ئاوی هەڵمژتەوە.

کەشتی لەسەر شاخی جودی لەنگەری گرت و خۆی گرتەوە.

نەفرەت لە بێبڕوایی کرا و بێبڕواکان لەکۆڵ بونەوە.(١)

خوا فەرمانی بە نوح کرد بە ئارامی دابەزێ.

نوح و خەڵکانی کەشتی بە ئارامی دابەزینە سەر زەوی و ترسی خنکانیان نەما.

(١) لە کۆڵ بونەوە: لەناو چون.

بێبڕواکانی نەتەوەی نوح لەناوچون، ئەرز و ئاسمان بۆیان نەگریان و خەفـەتبار نەبون.

پاشان خوا بەرەکەتی خستە نەوەی نوح، نەوەی نوح بەسەر زەویدا بڵاوبونـەوە و گەلێ شوێنیان ئاوەدان کردەوە.

چەندین پێغەمبەر و پاشایان لێ پەیدا بو.

سڵاوی خوا لەسەر نوح بێ، سڵاوی خوا لەسەر نوح بێ.

## ١- لە دوای نوحدا

خوا بەرەکەتی خستە نـەوەی نـوح و زۆر بـون، بەسـەر زەویـدا بڵاوبونـەوە، نەتەوەیەکیان تێدا هەڵکەوت پێیان دەگوتن نەتەوەی عاد.

نەتەوەی عاد پیاوی بەهێز و بە بازو بون، لاشەیان دەتگوت ئاسنە.

بەسەر هەمو کەسێکدا زاڵ دەبون، کەس بەسەریاندا زاڵ نەدەبو.

لەکەس نەدەترسان و هەمو کەس لێیان دەترسا.

خوا لە هەمو شتێکدا بەرەکەتی بە نەتەوەی عاد بەخشیبو.

گەلە وشتر و مێگەلە مەڕی عاد دۆڵی پڕ کردبو.

ئەسپ و هێستر و وڵاخی عاد دەشت و دەری داگرتبو.

منداڵ و نەوەی عاد خانوەکانیان پڕ کردبو.

کاتێك گەلە وشتر و مێگەلە مەڕی عاد بۆ لەوەڕ دەردەچون دیمەنێکی گـەلێ جوانیان دەنەخشاند.

سبەینان[1] کە منداڵ و تواڵ بۆ یاری دەردەچون دیـمەنێکی گەلـێ جوانیـان دەنەخشاند.

خاکی عاد خاکێکی جوان و سەوز بو، چەندین بیستان و کانیاوی لێبو.

(١) سبەینان: بەیانیان.

## ٢- ناسوپاسگوزاری عاد

بەڵام عاد لەسەر ئەم بەخششە زۆر و زەوەندانە سوپاسی خوایان نەکرد.

عاد ڕوداوی ئەو لافاوەیان لەبیر چو کە باب و باپیران بۆیان گێڕابونەوە و بە چاوی خۆشیان شوێنەوارەکەیان دەدی.

لەبیریان چو خوا لەبەر چ ئەم لافاوەی توشی نەتەوەی نوح کرد.

وایان لێهات هاوچەشنی نەتەوەی نوح بتیان دەپەرست.

بە دەستی خۆیان بتیان لە بەرد دادەتاشی، پاشان سوژدەیان بۆ بتەکان دەبرد و دەیانپەرستن.

لە بتەکان دەپاڕانەوە تا مراز و پێویستیەکانیان بۆ بێننە دی.

قوربانییان بۆ سەر دەبڕین.

هەمان ڕەفتاری نەتەوەی نوحیان دوبارە دەکردەوە.

نەتەوەی عاد عەقڵێکی وایان نەبو لە بتپەرستی دوریان خاتەوە.

عەقڵێکی وایان نەبو ڕاستەڕێیان پێ نیشان دا.

لە کاروباری دنیا زیرەك بون، بەڵام لەبارەی ئاین گەمژە بون.

## ٣- ستەم و دەستدرێژی عاد

تین و توانای عاد لە خۆیان و لە خەڵکی ببوە بەڵا.

چونکە بڕوایان بە خوا نەبو، بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نەبو.

مادامەکێ بێبڕواش بن چ شتێك هەیە لە ستەمیان وەدور بگرێ؟

چ شتێ هەیە لە دەستدرێژی دەستیان بگرێ؟

بۆچی ستەم لە خەڵکی نەکەن؟

خۆ کەس لەوان بەهێزتر نیە، خۆ ترسی لێپرسینەوە و تۆڵەیان نیە.

نەتەوەی عاد وەك دڕندەی دارستان بون، گەورە ستەمی لە بچوك دەکرد، بەهێز بێهێزی دەخوارد.

کە تورە دەبون وەك فیلی هاروهاجیان لێدەهات، دەیانکوشت و نەیاندەشاردەوە.

کە بە شەڕ دەهاتن کشتوکاڵ و دەغڵ و دانیان وێران دەکرد، منداڵ و پیر و ژنیان کوشت و بڕ دەکرد.

بچونایە ناو هەر گوندێك تەفروتونایان دەکرد و خەڵکەکەیان ڕیسوا دەکرد.

خەڵکی بێدەسەلات لێیان دەترسان و لەترسی ستەم و دەستدرێژی هەڵدەهاتن.

هێزەکەی عاد لە خۆیان و لە خەڵکی ببوە بەلا.

بێگومان هەر کەسێك لە خوا نەترسێ و بڕوای بەڕۆژی دوایی نەبێ لە نەتەوەی عاد باشتر نابێ!

## ٤- کۆشك و تەلارەکانی عاد

عاد هەر بە خواردن و خواردنەوە و یاری و ڕابواردن خەریك بون.

شانازییان بە کۆشك و تەلاری بەرز و خانوی فرەوانەوە دەکرد و لاف و گەزافیان لێدەدا.

پارەوپولەکەیان لە ئاو و قوڕ و بەرد بە فیڕۆ دەدا.

هەر شوێنێکی چۆڵ و هەر زەمینێکی بەرزیان دیبا کۆشکێکی باڵایان لەسەر هەڵدەنا.

خانوی وایان بنیاد دەنا وەك بڵێی تاهەتایە تێیدا بژین و هەرگیز نەمرن.

کۆشك و تەلاریان هەر بۆ جوانی دروست دەکرد.

کەچی خەڵکیش تێر بەزگی نانی نەبو، بەرگی نەبو دەبەری بکا!

هەژارەکان خانویان نەبو تێیدا نیشتەجێ بن، کەچی دەوڵەمەندەکانیش چەندین خانوی چۆڵیان هەبو.

هەر کەسێ نەتەوەی عاد و کۆشك و تەلارەکانی بدیبایە دەیزانی نەتەوەیەکی بێبڕوان و بڕوایان بە دوارۆژ[1] نیە.

## ٥- هودی پێغەمبەر

خوا ویستی پێغەمبەرێك بۆ عاد بنێرێ.

خوا ڕازی نابێ بەندەکانی بێبڕوا بن.

خوا حەز ناکا خراپەکاری لەسەر زەوی بڵاوبێتەوە.

عاد بیر و هۆشیان تەنها لە خواردن و خواردنەوە و یاری و ڕابواردن و دروستکردنی خانو بەکاردێنا.

بیر و هۆشیان گەندەڵ ببو چونکە لە ئاین بەکاریان نەدەهێنا.

---

(١) دوارۆژ: ڕۆژی دوایی.

عاد لە بارەی دنیا زیرەك بون بەڵام لـە بـارەی ئـاین گەمـژە بـون، بـەردیان دەپەرست و تێنەدەگشتن.

بۆیە خوا ویستی پێغەمبەرێکیان بۆ بنێرێ تا ڕێیِ ڕاستیان پێ‌نیشان دا.

خوا ویستی وابو پێغەمبەرەکە یەکێك بێ لە خۆیان، بیناسن و لە وتـەکانی بگەن.

هود بوە پێغەمبەر، هود لە بنەماڵەیەکی بەڕێز و خانەدانی نەتەوەی عاد لـە دایك ببو، لەسەر ژیری و چاکەخوازی پێگەیشت و گەورە بو.

## ٦- بانگەوازەکەی هود

هود بانگی نەتەوەکەی دەکرد و دەیگوت:

نەتەوەکەم! خوا بپەرستن جگە لە خوا خواوەندی ترتان نیە.

هود دەیگوت: نەتەوەکەم! ئێوە بۆچی بەرد دەپەرستن؟

بۆچی ئەو خوایە ناپەرستن کە دروستی کردون؟!

نەتەوەکەم! ئێوە دوێنێکە بە دەستی خۆتان ئەم بەردانــەتان داتاشـیوە چـۆن ئەمڕۆ دەیانپەرستن؟

خوا ئێوەی دروست کردوە، خوا بـژێوی پێبەخـشیون، خـوا مـاڵ و منـداڵ و کشتوکاڵ و ئەم هەمو نەوە زۆرەی پێبەخشیون، خوا ئێـوەی لـە دوای نەتـەوەی نوح کردۆتە جێنشین، خوا لاشە و بازوی بەهێزی پێبەخشیون.

ئێوە دەبێ لە پای[١] ئەم بەخششانە خوا بپەرستن، واز لــە پەرســتنی غــەیری خوا بێنن.

سەیری وەفای سەگ بکەن، لەپای پارچە ئیسقانێك ماڵەکەتان جێناهێڵــێ و وەکو سێبەر وەدواتان دەکەوێ!

بینیوتانە سەگێك خاوەنەکەی بەجێبێڵێ و وەدوای کەسێکیتر بکەوێ؟

بینیوتانە ئاژەڵێك بەرد بپەرستێ؟

بینیوتانە ئاژەڵێك سوژدە بۆ بتان بەرێ؟

ئایا مرۆ ڤ لە ئاژەڵ ڕیسواترە؟

ئایا ئاژەڵ لە مرۆڤ بەڕێزترە؟

## ٧- وەڵامی نەتەوەکەی

نەتەوەکەی هەر خەریکی خواردن و خواردنەوە و یــاری و ڕابــواردن بــون، لــە ژیانی دنیایی خۆش هاتبون و دڵیان پێوە بەند ببو.

لە وتەکانی هود هەراسان[٢] دەبون و لە ناو خۆدا بە یەکتریان دەگوت:

هود چ دەڵێ؟ هود چی دەوێ؟ ئێمە لە وتەکانی ناگەین!

ئەوانی تر دەیانگوت: بێمێشکە یاخود شێتە!

هود کە دوبارە بانگی کردنەوە.

---

(١) لە پای: لە بری، لە بەرامبەر.

(٢) هەراسان: بێزار، وەڕس.

پیاوماقوڵانی نەتەوەکەی گوتیان:

ئەی هود ! پێمان وایە مێشکت تێکچوە و درۆزنی.

هود گوتی: نەتەوەکەم! مێشکم تێکنەچوە و درۆزن نیم.

من پێغەمبەرم، خوای بونەوەر ڕەوانی کردوم تا پەیامەکانی خواتان پێ ڕابگەیەنم، من ئامۆژگاریتان دەکەم و بۆتان دڵسۆزم.

## ٨- دانایی هود

هود بەردەوام ئامۆژگاری نەتەوەکەی دەکرد و بەنەرمی و بە دانایی بۆ خواپەرستی بانگی دەکردن.

هود گوتی:

نەتەوەکەم! من تا دوێنێش برا و برادەرتان بوم! نامناسنەوە؟!

براکانم! بۆچی لێم دەترسن و لەبەرم هەڵدێن، خۆ من پارە و پوڵتان کەم ناکەمەوە.

نەتەوەکەم! کە من بۆ لای خوا بانگتان دەکەم داوای کرێتان لێناکەم، خوا پاداشتم دەداتەوە.

نەتەوەکەم! لە چی دەترسن ئەگەر بڕوا بە خوا بێنن؟

سوێندم بە خوا ئەگەر بڕوا بە خوا بێنن پارەوپوڵتان کەم نابێتەوە!

بەڵکو بە پێچەوانەوە خوا بەرەکەت دەخاتە بژێویتان و هێزوبازوتان زیاتر دەکا.

نەتەوەکەم! بۆچی لە پێغەمبەرایەتیم سەیر ماون؟

خۆ خوا لەگەڵ یەکەیەکەتان قسە ناکات!

خۆ خوا لەگەڵ تاك بە تاکتان نادوێ پێی بڵێ وا بکە و وا مەکە!

خۆ خوا بۆ هەر نەتەوەیەك پیاوێ دەنێرێ تا وتەکانی خوایان پێڕابگەیەنێ و ئامۆژگارییان بکا.

دڵنیا بن خوا منی ناردوە تا وتەکانی خواتان پێڕابگەیەنم و ئامۆژگاریتان بکەم.

بۆچی پێتان سەیرە ئەگەر یەکێك لە خۆتانەوە ببێتە پێغەمبەر؟!

## ٩- بڕوای هود

عاد هیچ وەلامێکیان پێنەبو!

نەیانزانی چۆن وەلامی هود بدەنەوە!

بەلام کاتێك بڕوبیانویان بڕا گوتیان:

خواوەندەکانمان دەستیان لێوەشاندوی، توشی نەخۆشی مێشکیان کردوی! بەلای خواوەندەکانت بەسەردا هاتوە!

هود گوتی: ئەم بتانە لە بەرد دروستکراون، زیان و قازانج بە هیچ کەسێك ناگەیەنن!

ئەم بتانە لە بەرد دروستکراون، نەدەدوێن و نەدەبیستن و نە دەبینن!

ئەم بتانە چاکە و خراپەیان بە دەست نیە!

سود و زیانیان بۆ کەس نیە!

ئێوەش چاکە و خراپەتان بە دەست نیە!

ناتوانن سود و زیانم پێبگەیەنن!

من بڕوام بە خواوەندەکانتان نیە و لێیان ناترسم.

من لە هاوبەشپەرستیەکەی ئێوە بێبەریم.[1]

لە ئێوە ناترسم چ دەکەن بیکەن.

من پشتم بە خوا بەستوە کە پەروەردگاری ئێوەیە، کە هەمو شتێکی لە دەستە، کە تەنانەت تاقە گەڵایەکیش هەڵناوەرێ ئەگەر ویستی ئەو خوایەی لەگەڵدا نەبێ.

## ١٠- کەللەڕەقایەتی عاد

نەتەوەی عاد هەمو ئەم وتە جوانانەی هودیان گوێ لێبو بەڵام بڕوایان نەهێنا!

ئامۆژگاریەکەی هود دادی نەدان!

داناییەکەی هود دادی نەدان!

گوتیان: ئەی هود! تۆ بەڵگەت نیە.

ئەی هود! ئێمە بەم قسە تازەیەی تۆ واز لە خواوەندە کۆنەکانمان ناهێنین.

چۆن بە قسەی یەکێکی وەك تۆ واز لەم خواوەندانە دێنین کە باب و باپیرانمان پەرستویانن؟

---

(١) بێبەری: نابەژدار.

نەخێر هەرگیز واز ناهێنین، نەخێر هەرگیز واز ناهێنین.

ئەی هود! تۆ بڕوا بە خواوەندەکانی ئێمە ناهێنی و لێیان ناترسی.

کەواتە ئێمەش بڕوا بە خوای تۆ ناهێنین ولێی ناترسین.

تۆ زۆر باسی سزا دەکەی، کوانێ سزا کەنگێ دێ ئەی هود؟

هود وەڵامی دانەوە و گوتی:

خوا دەزانێ کەنگێ سزاکەتان بەسەر دادێ.

من تەنها پێغەمبەرم و وریاتان دەکەمەوە.

عاد گوتیان: ئێمە چاوەڕێین و حەز دەکەین سزاکە ببینین.

هود سەیری بەم جۆرە بێباکییە هات.

هود داخی لەم جۆرە گەمژەییە هەڵکێشا.

## ١١- سـزا

عاد هەمو رۆژێ چاوەڕێی بارانیان دەکرد، تەماشای ئاسمانیان دەکرد پەڵە هەوری تێدا نەبو.

گەلێك پێویستی باران بون، گەلێك تامەزرۆی باران بون.

رۆژێك بینیان وا هەورگەلێ بەری ئاسمانێ دەگرن.

زۆر دڵخۆش بون و هاواریان کرد:

ئەمە هەوری بارانییە! ئەمە هەوری بارانییە.

خەڵکەکە لە دڵخۆشییان کەوتنە سەماکردن و هاواریان دەکرد:

هەوری باران! هەوری باران!

بەڵام هود تێگەیشت ئەمە سزاکەی خوایە بەری ئاسمانی گرتوە.

هود پێی گوتن: نەتەوەکەم! ئەمە هەوری میهرەبانی نیە، بەڵکو ڕەشەبای پڕ سزایە.

بەڵێ وابو، قسەکەی هود ڕەوا بو، ڕەشەبایەکی بەهێز و توندوتیژ هەڵیکرد، خەڵکەکە شتی وایان نەدیبو، خەڵکەکە شتی وایان نەبیستبو.

ڕەشەبا داری لە ڕەگەوە دەردێنا، خانوبەرەی وێران دەکرد، ئاژەڵی هەڵدەگرت و بەرەو شوێنی گەلێ دوری تێهەڵدەدا.

لمی بیابان پەرش و بڵاو بوەوە و، دنیا وەها تاریك داهات چاو چاوی نەدەدی.

خەڵکەکە ترسێکی گەورەیان لێ نیشت و لە ترسان تاسان، بە پەلەپروزێ و بەهەڵەداوانەوە[1] چونەوە ماڵێ و دەرگاکانیان لەسەر خۆ داخست.

منداڵەکان ئاوێزانی[2] دایکیان بون، خەڵك خۆیان توند بە دیواران گرت، خەڵك خۆی لە زەندۆڵ[3] و لە ئەشکەوتان حەشار دا.[4]

منداڵ دەگریان، ژن دەیانقیژاند، پیاو هاواریان دەکرد و دەپاڕانەوە...

بەڵام ئەمڕۆ کەس لە سزای خوا رزگاری نابێ.

ڕەشەبا حەفت شەو و هەشت ڕۆژی خایاند.

---

(١) بە هەڵەداوان: بەتاڵوکە، بە پەلەپەل. بە پەلەپروزێ: بە پەلەپەل.

(٢) ئاوێزان: خۆ دەئامێزدان.

(٣) زەندۆڵ: قەڵشی زل لە زەویدا.

(٤) حەشاردان: شاردنەوە.

نەتەوەکەی هەمو مردن، وەك دارخورمای بەسەریەکدا شکاو بە خامۆشــی[1] لەسەر زەوی کەوتن.

دیمەنێکی هەتا بڵێی سەیر و سەمەرە بو.

خەڵك مردبون، داڵ[2] و باڵندە گۆشتی دەخواردن.

خانوەکان خاپور ببون و کوندەبۆ ئاوەدانیان کردبۆوە!

هود و بڕوادارەکانیش بە هۆی بڕواکەیانەوە ڕزگار بون.

عادیش بە هۆی بێبڕوایی و کەللەڕەقیەوە لەناو چون.

نەتەوەی عاد بێبڕوا بون بۆیە کەوتنە بەر نەفرینی خوا.

---

(١) خامۆش: کپ، بێ هەست و خوست.

(٢) داڵ: باڵندەیەکی گەورەی مردار خۆرە.

## ١- لەدوای نەتەوەی عاددا

نەتەوەی ثەمود جێگەی نەتەوەی عادیان گرتەوە.

هەروەك چۆن نەتەوەی عاد جێگەی نەتەوەی نوحیان گرتبوەوە.

نەتەوەی ثەمود لە دوای نەتەوەی عاد پەیدا بون.

هەروەك چۆن نەتەوەی عاد لە دوای نەتەوەی نوح پەیدا ببون.

خاکی ثەمود خاکێکی جوان و سەوز بو، چەندین بیستان و کانیاوی لێبو، چەندین باخی تێدا بو ڕوباریان بە بەردا دەڕۆیی.

ثەمود وەکو عاد لە بیناسازی و کشتوکاڵ و باخ و باخچەکاریدا دەستڕەنگین بون.

بەڵکو زیرەکتریش بون و لە پیشەسازیدا پێشکەوتوتر بون.

خانوی گەورە گەورەیان لە شاخەکان دادەتاشی، نەخش و نیگاری دڵڕفێنیان لە تاشەبەردان هەڵدەکۆڵی.

نەتەوەیەکی زیرەك بون، پیشەسازیەکەیان پێشکەوتو بو، بە عەقڵ و پیشەسازییان بەردیان نەرم کردبوەوە و چۆنیان بویستایە دایاندەڕشت.

ئەگەر مرۆڤ چوبایە ناو شارەکەیان شتی گەلێ سەیر و سەمەرەی دەدی.

کۆشکی گەورە گەورەی وەك شاخی وای دەدی دەیگوت: هەڵبەت جنۆکە دروستیان کردوە.

گوڵ و گوڵزاری زۆر جوانی وای بە قەد دیوارەکانەوە دەبینی دەیگوت: هەڵبەت بەهار ڕواندونی.

خوا لە ئاسمان و لە زەوی دەرگای بەرەکەتی لە پهمود کردبوەوە.

خوا دەرگای هەمو خێروبێرێکی لە پهمود کردبوەوە.

ئاسمان بارانی بە لێزمەی بۆ دەباراندن.

زەوی ڕوەك و گوڵی ڕەنگاوڕەنگی بۆ دەڕواندن.

بیستان و میوەجات و بەروبومی جۆراوجۆری بۆ وەبەرهەم دێنان.

خوا بەرەکەتی خستبوە بژێوی و تەمەنیان.

## ٢- ناسوپاسگوزاری ثەمود

بەڵام ثەمود لە پای ئەم هەمو بەهرە و بەخششەی کە خوا پێی بەخشیبون، سوپاسی خوایان نەکرد و بەرەو خواپەرستی نەچون.

بەڵکو بە پێچەوانەوە توشی بێبڕوایی بون و یاخی بون، خوایان لەبیر کرد و لە خۆ بوغرا بون[1]، دەیانگوت: کێ هەیە لە ئێمە بەهێزتر بێ؟!..

وایاندەزانی بۆ هەمیشە نامرن و کۆشك و باخەکانیان تاهەتایە جێناهێڵن!

وایاندەزانی مردن ناتوانێ بگاتە ناو شاخەکان!

ڕەنگە وا تێگەیشتبن کە نەتەوەی نوح لەبەرئەوە لە لافاودا خنکاون چونکە لە دۆڵ نیشتەجێ بون!

عادیش بۆیە لەناوچون، چونکە لە بیابان بون!

بەڵام خۆیان لە ترس و مردن دورن، چونکە لە شوێنێکی ئارام و مەحکەمن[2]!

---

(١) بوغرابون: مەغروربون.

(٢) مەحکەم: قایم و توندوتۆڵ.

## ٣- پەرستنی بت

هەر بەوەندە نەوەستان بەڵکو بەردیان دادەتاشی و بتیان دەپەرست.

وای لێهات وەك نەتەوەی نوح و عاد بەردیان دەپەرست.

خوا کردبونیە پاشای بەردان، بەڵام ئەوان بونە بەرد پەرست چونکە نەفام بون.

خوا میهرەبانی لەگەڵدا کردن و خێروبێری پێبەخشین، بەڵام ئــەوان خۆیــان و مرۆڤیان ڕیسوا کرد.

خوا ستەم لە هیچ کەس ناکا، بەڵام خەڵك خۆیان ستەم لە خۆیان دەکەن.

سەیرە! ئەو بەردەی کە بە دەستی خۆیان دایدەتاشن کە نە لێیان یاخی دەبـێ و نە لێیان تورە دەبێ، ملکەچی دەبن و سوژدەی بۆ دەبەن!

ئایا بەهێز بێهێز دەپەرستێ؟

ئایا گەورە سوژدە بۆ بەندەکەی دەبات؟

بەڵام ثەمود لەبەر ئەوەی خوایان لەبیر کردبو بۆیە خۆشیان لەبیر کرد.

لەبەرئەوەی ڕازی نەبون خوا بپەرستن بۆیە خوا ڕیسوای کردن.

## ٤- صالح سڵاوی خوای لــێبێ

خوا ویستی وابو پێغەمبەرێکیان بۆ بنێرێ.

وەك چۆن پێشتر پێغەمبەری بۆ نەتەوەی نوح و بۆ نەتەوەی عاد ناردبو.

خوا ڕازی نابێ بەندەکانی بێبڕوا بن.

خوا حەز ناكا خراپەكاری لەسەر زەوی بڵاوبێتەوە.

عاد پیاوێكیان لە ناودا بو ناوی صالّح بو.

صالّح لە بنەماڵەیەكی بەڕێز و خانەدان لە دایك ببو.

لەسەر ژیری و چاكەخوازی پێگەیشتبو و گەورە ببو.

صالّح كوڕێكی زۆر مەند(١) بو.

كوڕێكی زۆر زیرەك و ئازا بو.

خەڵك لە مەجلیسان باسیان دەكرد.

كە دەیاندیت پەنجەیان بۆ ڕادەداشت(٢) و دەیانگوت:

ئەمە صالّحە، ئەمە صالّحە.

خەڵك هومێدێكی زۆریان پێ هەبو.

دەیانگوت: ئەم كوڕە داهاتویەكی گەشی دەبێ، شـان و شـكۆیەكی مـەزنی دەبێ.

خەڵك پێی وابو صالّح دەبێتە یەكێك لە پیاوە گەورەكانیان، دەبێتـە یـەكێك لە دەوڵەمەندەكانیان.

پێیان وابو دەبێتە خاوەنی كۆشكی جوان و باخی گەورە و جۆراوجۆر.

باوكی دەیگوت: كوڕەكەم زیرەك و ژیرە بۆیە دەوڵەمەند دەبێ.

لەناو خەڵك ناوبانگ دەردەكا، بە سواری ماینەوە دەردەچێ.

---

(١) مەند: سەنگین.

(٢) ڕاداشتن: ئاماژەكردن.

نۆکەر و خزمەتکارێکی زۆری لە دواوە دەڕوا.

ئەوجا خەڵك سڵاوی لێدەکەن و دەڵێن:

ئەم پیاوە بەناز و نوزە کوڕی فلانە!

ئەم پیاوە پۆشتە و کەشخەیە کوڕی فلانە!

ئەوکات باوکی بەم قسانە چەند دڵخۆش دەبێ کە بە کوڕەکەی دەڵێن: ئای کە کوڕێکی بەختەوەرە، ئای کە کوڕێکی دەوڵەمەندە.

بەڵام خوا مەبەستێکی تری هەبو.

خوا دەویست صالح بکاتە پێغەمبەر و بۆ نەتەوەکەی بینێرێ تا لە تاریکستانی بۆ ڕوناکی دەریانبێنێ.

جا هیچ پلەیەك هەیە لە پلەی پێغەمبەرایەتی بەرزتر بێ؟

جا هیچ ڕیز و شان و شکۆیەك هەیە لە پێغەمبەرایەتی مەزنتر بێ؟

## ٥- بانگەوازەکەی صالح

صالح بەناو نەتەوەکەیدا دەگەڕا و پڕ بە دەنگی خۆی هاواری دەکرد:

نەتەوەکەم! خوا بپەرستن جگە لە خوا هیچ خواوەندێکی ترتان نیە.

دەوڵەمەندەکان هەر خەریکی خواردن و خواردنەوە و یاری و ڕابواردن بون، تەنها بتیان دەپەرست و لە بت بترازێ هیچ خوایەکیان پێ خوا نەبو.

دەوڵەمەندەکانی پهمود بانگەوازەکەی صالحیان بەدڵ نەبو و لێی توڕە بون.

گوتیان: ئەوە کێیە وا هاوار دەکا؟

نۆکەرەکان گوتیان: قوربان ئەوە صاڵحە.

گوتیان: چ دەڵێ؟

گوتیان دەڵێ: خوا بپەرستن و جگە لە خوا هیچ خواوەندێکی ترتان نیە.

دەڵێ: خوا لە پاشی مردن زندوتان دەکاتەوە و سزا و پاداشتان دەداتەوە.

دەڵێ: من پێغەمبەرم خوا منی بۆ نەتەوەکەم ناردوە تا ڕێی ڕاستیان پێ نیشان دەم.

دەوڵەمەندەکان پێکەنین وگوتیان:

هەژارێکی داماو! چۆن دەبێتە پێغەمبەر؟

خۆ کۆشك و تەلار و باخی نیە، خۆ کشتوکاڵ و باخی دارخورمای نیە! چۆن دەبێتە پێغەمبەر؟

## ٦- پڕوپاگەندەی دەوڵەمەندەکان

دەوڵەمەندەکان هەستیان کرد وا دێ خەڵکانێك دڵیان بەلای صالح دەچێ و خەریکە شوێنی بکەون، بۆیە لە دەسەڵاتەکەی خۆیان ترسان و بەخەڵکەکەیان دەگوت:

ڕاست ناکا، پێغەمبەر نیە، ئەویش وەك ئێوە مرۆڤە، وەك ئێوە نان و ئاو دەخوا.

پێی بڕوا مەکەن و شوێنی مەکەون ئەگەرنا زەرەر دەکەن.

پێتان دەڵێ: لە دوای مردن کە بونە خۆڵ و ئێسك و پروسك زندو دەکرێنەوە؟!

مەحاڵە[١] شتی وا ڕاست بێ، ئەم قسانە بەڵێنی پوچن.

ژیان هەر ژیانی دنیایە و ژیانی تری بەدوا نایە، بۆ هەمیشە دەمرین و هەرگیز زندو نابینەوە.

ئەم صاڵحە درۆ بەدەم خواوە دەکا و هەرگیز پێی بڕوا ناکەین.

## ٧- بە هەڵەدا چوین

خەڵك بڕوایان بە صاڵح نەهێنا.

کاتێك صاڵح ئامۆژگاری دەکردن و ڕێی بتپەرستی لێ دەگرتن.

دەیانگوت: صاڵح! تۆ کوڕێکی زۆر مەند بوی.

کوڕێکی زۆر زیرەك و ئازا بوی.

واماندەزانی دەبیە گەورەی خەڵك و پیاوێکی ناودارت لێ دەردەچێ.

وامان دەزانی وەکو فلان و فیسارە کەس دەوڵەمەند و مەزن دەبی.

بەڵام هیچت لێ دەرنەچو.

ئەوانەی ئاوزای[٢] تۆ بون و وەکو تۆ زیرەك و ژیریش نەبون، پیاوی گەورە گەورەیان تێدا هەڵکەوت.

صاڵح! تۆ ڕێگای هەژاریت هەڵبژارد.

ئێمە لە تێڕوانینمان بەرامبەر بە تۆ بە هەڵەدا چوبوین.

هومێدی ئێمەت نەهێنا دی.

---

(١) مەحاڵە: ئەستەمە، مستحیل.

(٢) ئاوزا: هاوتەمەن.

هومێدی باوکی هەژارت هەڵوەراند و هیچ خێر و سودێکت پێنەگەیاند.

هومێدی دایکت هەڵوەراند و ماندو بونیت بەفیڕۆ دا.

تەنانەت خۆشت دۆڕاند!

صاڵح گوێی لە هەمو ئەم قسانە بو، ئاخ و داخی لە نەتەوەکەی هەڵدەکێشا.

کە صاڵح بەلایاندا ڕادەبوری[1] پێیان دەگوت:

خوا ڕەحم بە باوکی بکات کوڕەکەی فەوتاوە.

## ٨- ئامۆژگاریەکەی صاڵح

صاڵح بەردەوام ئامۆژگاری نەتەوەکەی دەکرد و بەنەرمی و دانایی بۆ خواپەرستی بانگی دەکردن.

دەیگوت: براکانم! وا دەزانن تاهەتایە هەر لێرەدا دەمێننەوە؟

وا دەزانن بۆ هەمیشە لەناو ئەم باخ و بێستان و ڕوبارانە دەمێننەوە؟

وا دەزانن تاسەر[2] هەر لە بەروبومی ئەم کشتوکاڵ و دار و درەختانە دەخۆن؟

وا دەزانن ئەم هێزەتان هەر دەمێنێ و هەر دەتوانن خانو لەشاخان داتاشن؟ هەرگیز! هەرگیز! قەت وانابێ! قەت وانابێ!

براکانم ئەگەر وابێ ئەدی بۆچی باب و باپیرانتان مردن؟

خۆ ئەوانیش کۆشك و تەلاریان هەبو، باخ و بێستان وکانیاویان هەبو، کشتوکاڵ و دارخورمایان هەبو،ئەوانیش خانویان لە شاخ دادەتاشی ولەناو

---

(١) ڕادەبوری: ڕەت دەبو، تێدەپەڕی.

(٢) تاسەر: تا هەتایە.

شاخان نیشتەجێ بون.

بەڵام ئەم شتانە دادی نەدان! ئەم شتانە لە مردن ڕزگاری نەکردن!

فریشتەی مەرگەوان[1] گەیشتە ئەوانیش و گیانی کێشان!

ئێوەش بەجۆرە هەموتان دەمرن و پاشان خوا زندوتان دەکاتەوە، لەبارەی ئەم بەخشش و بەهرانەوە لێتان دەپرسێتەوە.

## ٩- داوای کرێتان لـێ ناکەم

براکانم! بۆ لەبەرم هەڵدێن؟ لە چ دەترسن؟

خۆ من پارەوپولتان لـێ کەم ناکەمەوە، داوای کرێتان لـێ ناکەم.

من ئامۆژگاریتان دەکەم، پەیامی خواتان پێڕادەگەیەنم.

پاداشتی من لەلای خوایە.

براکانم! بۆچی گوێڕایەڵم نابن؟ من بۆ ئێوە ئامۆژگارێکی دەستپاکم.

بۆچی گوێڕایەڵی ستەمکاران دەبن؟!

ئەو ستەمکارانەی کە بە ناڕەوا ماڵی خەڵکی دەخۆن؟

کە خراپەکاری لەسەر زەوی بڵاودەکەنەوە و کاری چاك بەرپا ناکەن!

نەتەوەکە بڕوبیانویان بڕا و هیچ وەڵامێکیان نەدۆزیەوە.

گوتیان: صالح! دیارە جادوت لێکراوە، تـۆش وەکـو ئێمـە مرۆڤـی، ئەگـەر ڕاست دەکەی پێغەمبەری بەڵگەیەکمان بۆ بێنە.

---

(١) فریشتەی مەرگەوان: فریشتەی گیانکێش.

## ١٠- وشترەکەی خوا

صاڵح گوتی: چ بەڵگەیەکتان دەوێ؟

گوتیان: ئەگەر ڕاست دەکەی پێغەمبەری، لەم شاخە وشترێکی ئاوسمان[١] بۆ دەربێنە!

خەڵك دەیانزانی وشتر تەنها لە وشتر دەبێ.

دەیانزانی وشتر لە زەوی ناڕوێ و لە بەرد وەبەرهەم نایێ.

بێگومان بون کە صاڵح داواکەی پێ جێبەجێ ناکرێ و سەردەکەون!

بەڵام صاڵح بڕوای بە خوا بەهێز بو.

دەیزانی خوا هەمو شتێکی پێدەکرێ.

صاڵح لە خوا پاڕایەوە داواکە بێنێتە دی.

خوا داواکەی قبوڵ کرد و شاخەکە وشترێکی ئاوسی لێ پەیدا بو، پاشان بێچوێکیشی بو.

خەڵك سەرسام بون و دۆش دامان[٢].

بەڵام تەنها یەك کەس بڕوای پێ هێنا.

(١) ئاوس: ئاژەڵی زگپڕ.

(٢) دۆش دامان: حەیران بون.

## ١١- نۆرە بە نۆرە

صاڵح گوتی: ئەوەتانێ وشترەکەی خوا، ئەوەتانێ بەڵگەکەی خوا، ئێوە داواتان کرد خواش بە توانای خۆی دروستی کرد.

ڕێزی ئەم وشترە بگرن، ئازاری نەدەن دەنا توشی سزا دەبن.

ئەم وشترە بە ئارەزوی خۆی لەسەر زەوی خوا دەلەوەڕێ و ئاو دەخواتەوە، بە خۆی دەچێ و دەگەڕێتەوە، ئالیك و ئاوی لەسەر ئێوە نیە، ئالیك زۆرە و ئاویش زۆرە.

وشترەکە وشترێکی زەبەللاح بو، لاشەیەکی سەیری هەبو، مەڕ و ماڵات کە چاویان پێدەکەوت لێی دەترسان و دەڕەوینەوە، کە وشترەکە دەهات ئاو بخواتەوە مەڕ و ماڵات دەسڵەمینەوە[1] و هەڵدەهاتن.

صاڵح کە ئەم حاڵەی دیت گوتی: با ڕۆژێك بۆ وشترەکە بێ، ڕۆژێکیش بۆ مەڕ و ماڵاتی ئێوە بێ.

با ڕۆژێك وشترەکە ئاو بخواتەوە، ڕۆژی دواتر مەڕ و ماڵاتەکەتان.

بەمجۆرە ڕێککەوتن، وشترەکە لە نۆرەی خۆیدا دەچو ئاوی دەخواردەوە، مەڕ و ماڵاتیش لە نۆرەی خۆیان ئاویان دەخواردەوە.

---

(١) سڵەمینەوە: ڕەوینەوە، ساردبونەوە لە شتێك.

## ١٢- یاخیبونی ثەمود

نەتەوەکەی صالّح لەخۆبایی و یاخی بون.

گوتیان: بۆچی مەڕ و ماڵاتەکەمان هەمو ڕۆژێ ئاو نەخۆنەوە.

خەڵك لە وشترەکە بێزار بون.

صالّح پێشتر بە خەڵکەکەی گوتبو ئەزیەتی وشترەکە نەدەن، بەلاّم گوێیان پێنەدا.

گوتیان کێ ئەم وشترە دەکوژێ؟

پیاوێك گوتی: من دەیکوژم.

پیاوێکی تریش گوتی: منیش دەیکوژم.

ئەم دو بەدبەختە چون لەسەر ڕێی وشترەکە خۆیان دانوساند[1] و چاوەڕێ بون تا وشترەکە لە مۆڵگەکەی هاتە دەرەوە.

کاتێك وشترەکە لە مۆڵگەکەی[2] هاتە دەرەوە پیاوی یەکەم تیرێکی تێگرت و ئەنگاوتی.

پیاوی دوەمیش سەری بڕی و کوشتی.

---

(١) خۆدانوساندن: ڕەوینەوە، ساردبونەوە لە شتێك.

(٢) مۆڵگە: جێی حەوانەوەی وشتر و مەڕوماڵات.

## ١٣- ســــزا

صــاڵح کاتێــك زانــی وشــترەکەیان ســەربڕیوە و کوشــتویانە داخێکــی زۆری هەڵکێشا و زۆر غەمگین بو.

گوتی: ڕابوێرن! تەنها ســێ ڕۆژتــان مــاوە ســزای خواتــان بــۆ دابــەزێ، ئــەم هەڕەشەیە درۆ نیە تێبگەن.

لەم شارەدا نۆ پیاوی خراپەخوازی بێچاکە هەبون، سوێندیان خوارد و گوتیــان لە شەودا صالح و ژن و منداڵەکانی دەکوژین، ئەگەر لێیان پرسین کێ کوشتونی؟ دەڵێین ئاگامان لــێ نیە.

بەڵام خوا صاڵح و خێزانەکەی دەپارێزێ.

لە ڕۆژی سێیەمدا سزای خوا دابەزی.

نەتەوەی ثەمود وەك باوی ڕۆژانەیان بەیانی لە خەو هەڵسان.

بەڵام قیژە و بومەلەرزەیەکی گەلــێ توندوتیژ هات.

قیژەیەکی وا بەهێز بو هەمو دڵیان داچڵەکا و تاسان.

بومەلەرزەیەکی وا توندوتیژ بو هەمو خانوەکانی ڕوخاند.

ئەم ڕۆژە سەختە ڕۆژی ڕەشی ثەمود بو.

هەمو خەڵکەکە مردن، شار وێران و خاپور بو.

صاڵح لەگەڵ بڕوادارەکان ئەم شارەیان بەجێهێشت و کۆچیان کرد.

جا ئەگەر بمێننەوە چ بکەن؟

صاڵح کە لە شار دەرچو، نەتەوەکەی دیت وا هــەمو مــردون و بــە خامۆشــی لەسەر زەوی کەوتون.

بە دەنگێکی خەمینەوە[1] گوتی:

نەتەوەکەم! پەیامی خوام پێڕاگەیاندن و ئامۆژگاریم کردن بەڵام منی ئامۆژگارتان نەویست بۆیە بەم ڕۆژە ڕەشە گەیشتن.

مرۆڤ ئەگەر ئەمڕۆ بەلای ئەم شارەدا تێپەڕێ تەنها ئاسەواری[2] چەند کۆشکێکی وێران و چەند بیرێکی وشکبو دەبینێ، تەنها چەند گوندێکی چۆڵ و وێران دەبینێ.

پێغەمبەرمان ﷺ جارێکیان لەگەڵ یاوەرەکانی سەفەرێکی بەرەو شام کرد، جا کە بەلای شاری ثەمود تێپەڕین فەرموی:

(مەچونە ناو خانوبەرەی ئەم ستەمکارانە، ئەگەر چوشن بەگریانەوە بڕۆن با سزاکە توشی ئێوەش نەبێ).

نەتەوەی پهمود بێبڕوابون بۆیە کەوتنە بەر نەفرەینی خوا.

(١) خەمین: خەمگین: خەفەتاوی.

(٢) ئاسەوار: شوێنەوار.

## ١- لە کەنعانەوە بەرەو میسر

یەعقوب (سلاوی خوای لـێبێ) لەگەڵ کورەکانی بۆ میـسر کۆچیان کـرد و لەوێ نیشتەجێ بون.

لەبەر ئەوە کۆچیان کرد چونکە یوسفی کوڕی یەعقوب (سـلاوی خوایـان لـێبێ) گەورە و فەرمانڕەوای میسر بو.

یەعقوب و کوڕەکانی لە کەنعاندا مەڕ و ماڵاتیان بە خێـو دەکـرد و شـیریان دەدۆشی و خورییان دەفرۆشت، بە ماندوبونێکی زۆرەوە دەژیان.

کەچـی ڕاژەکـار[1] و بەنـدەکانی یوسـف لـە میـسردا لەوپـەڕی خۆشـی و تێروتەسەلی دەژیان!

کەواتە لە کەنعان چ بکەن؟ بۆچی بۆ میسر کۆچ نەکەن؟

یوسف بە دوای یەعقوب و خزمەکانی دانارد بێن بۆ میسر.

یوسف ئەگەر باوك و براکانی نەبینێ چێژ لە خواردن و خواردنەوە ناکا.

جا چۆن چێژ لە خواردن و خواردنەوە دەکا.

چۆن لە ژین دڵخۆش دەبێ کە خۆی بە تاقی تەنیا لە میسر بێ و لـە بـاوك و براو خزمانی دور بێ؟!!

چ لە کۆشك و تەلاری[2] خۆش بکات کە باوك و براکانی لە خانوێکی بچوکدا بن؟!

یەعقوب و کوڕەکانی هاتنە میسر.

---

(١) ڕاژەکار: خزمەتکار.

(٢) تەلار: باڵاخانە.

یوسف پێشوازی لێکردن و دڵی شاد بو.

خەڵکی میسر پێشوازیان لە خانەوادەی پاشای چاکەخواز کرد و دڵیان خۆش بو.

خەڵکی میسر لەبەر خۆشەویستی یوسف و چاکە و میهرەبانیەکەی؛ ئەم بنەماڵە نەجیمزادەیان خۆشویست.

چونکە یوسف بۆ ئەوان وەك برایەکی دڵسۆز و بە بەزەیی بو.

یەعقوب بۆ ئەوان وەك باوکێکی بە شان و شکۆ و سەنگین بو.

یەعقوب بوە گەورە و پیری وڵات، خەڵکی میسریش وەك کوڕی یەعقوبیان لێهات.

یەعقوب و کوڕەکانی میسریان کەوتە بەر دڵی و بە دڵخۆشی تێیدا نیشتەجێ بون، میسر بوە وڵاتیان.

## ٢- لە دوای یوسفدا

دوای ماوەیەك یەعقوب کۆچی دوایی کرد، یوسف خەمبار و پەرێشان بو، خەڵکی میسر خەمبار و پەرێشان بون.

یەعقوبیان لە میسر شاردەوە، هێند بۆی خەمبار بون دەتگوت باوکی خۆیانە مردوە.

دوای ماوەیەکی تر یوسفیش کۆچی دوایی کرد، خەڵکی میسر بەم ڕوداوە زۆر دڵتەنگ و پەرێشان بون، زۆر زاری[١] بون و گەلێ گریان.

(١) زاری: شیوەن و گریانی تازیەداری.

خەڵك لەبەر خەمی مەرگی یوسف خەمی خۆیان لەبیر نەما، دەتگوت پێشتر قەت ناخۆشییان بەسەر نەهاتوە.

یوسفیشیان بەخاك سپارد و سەرەخۆشیان لە یەکتری گۆڕیەوە، بۆ یوسفیش دڵ پڕ خەم و پەرێشان بون.

منداڵەکان بابەیان لێ بزر بو، گەورەکان برایان لێ بزر بو.

خەڵکەکە چونە لای براکانی یوسف و منداڵەکانیان و دڵیان دانەوە.

پێیان گوتن: بەڕێزان! بەسەرهاتی ئێوە بەسەرهاتی ئێمەشە، خەمی ئێوە خەمی ئێمەشە، ئەمڕۆ برایەکی بەبەزەیی و گەورەیەکی میهرەبان و پاشایەکی دادگەر بە جێی هێشتوین.

ئەو بو کە خەڵکی حەساندەوە و ستەمی لە وڵات ڕەواندەوە.

ئەو بو نەیهێشت بەهێز بێهێزان هەڵلوشێ[1] و زوڵمی گەورەی لە بچوکان بڕاندەوە.

ئەو بو لە هانای ستەمدیدان دەهات و برسی تێر دەکرد و ترساوی لە مەترسی پەڕاندەوە.

ئەو بو ئێمەی بۆ ڕاستەڕێ ڕێنوێن کرد و بۆ لای خوا بانگی کردین.

بەرلەوەی پێی بەخێری بنێتە وڵات ئێمە وەك ئاژەڵ وابوین و خوامان نەدەناسی، لەڕۆژی دوایی بێئاگا بوین.

ئەو بو ڕەوای[2] چەسپاندەوە.

---

(١) هەڵلوشین: قوت دان.

(٢) ڕەوا: هەق.

ئەو بو لە برسێتی ڕزگاری کردین.

ئەو بو برسییانی بەسەر دەکردەوە.

ئەو بو ئابوری بوژاندەوە.

ئێمە هەرگیز پاشای پایەدار و چاکەکاری خۆمان لەیاد ناکەین.

قەت ئێوەی برا و کەسوکاری ئەم ئازیزە لەبیر ناکەین.

دەزانن کە ئێوە هاتنە میسر پاشامان چەند دڵخۆش بو.

دەزانن ئێمەش بە دڵخۆشی پاشا چەند دڵخۆش بوین.

بەڕێزان! وڵات وڵاتی خۆتانە، خۆتان بە نامۆ[1] مەزانن، لە ڕۆژگاری پاشا چۆن بوین لەمەودواش هەر وا دەبین و لە خزمەتتان دادەبین.

## ٣- نەوەی ئیسرائیل لە میسردا

بەمجۆرە ڕۆژگارێکی درێژ تێپەڕی.

خەڵکی میسر قسەی خۆیان بەجێ‌گەیاند و ڕێزی کەنعانیەکانیان دەگرت و چاکەیان لەگەڵدا دەکردن.

کەنعانیەکان کە پێیان دەگوتن (نەوەی ئیسرائیل) خاوەن شەرەف و شکۆ و پارەوپولێکی زۆر بون.

بەڵام پاشان ڕەوشەکە[2] بە جۆرێکی تر گۆڕا.

---

(١) نامۆ: لابیدە، غەریب.

(٢) ڕەوش: حاڵ و بار.

نەوەی ئیسرائیل ڕەوشتیان تێکچو، وازیان لە بانگەوازی ڕێی خوا هێنا، خەڵکیان بۆ خواپەرستی بانگ نەدەکرد و دڵیان بە دنیاوە نوسا.

لەبەر ئەوە خەڵکیش هەڵوێستیان لە بەرامبەردا گۆڕین، بە چاوێکی تر سەیریان دەکردن، لەگەڵ پێشان جیاواز بو کە سەیری باپیرانیان دەکردن.

نەوەی ئیسرائیل وەك خەڵکی تریان لێهات و تەنها بە ڕەچەڵەك لە خەڵکی تر جویێ دەکرانەوە.

خەڵك حەسودیان بە دەوڵەمەندەکانیان دەبرد و بە سوکی سەیری هەژارەکانیان دەکردن.

وای لێهات خەڵکی میسر وەك نامۆی وڵاتێکی تر سەیریان دەکردن، مافیان لە میسردا نیە.

خەڵکی میسر پێیان وابو خۆیان خەڵکی وڵاتن و میسر بۆ میسرییەکانە.

هەندێك لە خەڵکی تری میسر پێیان وابو یوسف کەسێکی نامۆیە، چونکە لە کەنعانەوە هاتوە.

عەزیزی میسر کڕیویەتی.

پێیان وابو پیاوێکی کەنعانی بۆی نیە حوکمی میسر بگێڕێ.

زۆربەی خەڵك چاکەو ڕێز و میهرەبانی یوسفیان لە بیر کرد.

## ٤- فیرعەونی میسر

چەند فیرعەونێك[1] هاتنە سەر تەختی فەرمانڕەوایی میسر، زۆریان ڕك[2] لە نەوەی ئیسرائیل دەبۆوە.

پاشایەکی زۆر زۆردار و بە زەبروزەنگ هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی میسر، پێی گرنگ نەبو کە نەوەی ئیسرائیل نەوەی پێغەمبەران بن یان لە بنەماڵەی یوسفی چاکەخوازی پاشای میسر بوبن.

بەڵکو بە مرۆڤیشی دانەدەنان و بە چاوی بەزەیی و دادپەروەری تەماشای نەدەکردن.

پاشایەکی زۆر زۆردار و بە زەبروزەنگ هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی میسر.

پێی وابو نەتەوەکەی (کە قیبت بون) جۆرە مرۆڤێکن و نەوەی ئیسرائیلیش جۆرە مرۆڤێکیتر.

پێی وابو قیبتیەکان لە جۆری پاشایانن و بۆ فەرمانڕەوایی ئەفرێنراون.

بەڵام نەوەی ئیسرائیل لە جۆری کۆیلانن و بۆ نۆکەری[3] خولقێنراون.

فیرعەون وەك کەر و ئاژەڵ ڕەفتاری لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل دەکرد، کە ئاشکرایە مرۆڤ تەنها بە بڕەنانێکی ڕۆژانەیی کاری بێگاری بە کەر و ئاژەڵان دەکات.

---

(١) فیرعەونەکان: پاشاکانی میسر.

(٢) رك: قین.

(٣) نۆکەر: خزمەتکار.

فیرعەون پاشایەكی بەزەبروزەنگ و لەخۆبایی بو، كەسی لە خۆی پێ بەهێزتر نەبو.

بڕوای بەخوا نەبو و دەیگوت: (من خوای هەرە بەرزتانم).

بە هێز و موڵك و كۆشك و تەلارەكانی بوغرا ببو و دەیگوت:

تەماشاكەن، موڵكی میسر و ئەم هەمو ڕوبارانە هەموی هی منن.

وەك نەمرودی پاشای بابل ڕەفتاری دەكرد.

ئەگەر بیزانیبایە یەكێكی لەو بەهێزتر هەیە توڕە دەبو.

داوای لە خەڵكی كردبو بیپەرستن و سوژدەی بۆ ببەن.

خەڵكیش گوێڕایەڵی ببون.

بەڵام نەوەی ئیسرائیل نەیاندەپەرست و سوژدەیان بۆ نەدەبرد، چونكە بڕوایان بە خوا و بە پێغەمبەران هەبو.

بۆیە فیرعەون هەر بە یەكجار لە نەوەی ئیسرائیل توڕە ببو.

## ٥- سەربڕینی منداڵان

پێشبینێكی[1] قیبتی چوە لای فیرعەون و پێی گوت:

لە نەوەی ئیسرائیلدا كوڕێك لە دایك دەبێ پاشایەتیت لەناو دەبا.

فیرعەون كە گوێی لەم قسەیە بو شێت و هار بو، فەرمانی بە جەندرمەكانی كرد هەر كوڕێك لە نەوەی ئیسرائیل لە دایك ببێ سەری ببڕن و بیكوژن.

---

(١) پێشبین واتە كاهین: ئەو كەسەی شتێك پێشبینی دەكات بۆ داهاتو. (وەرگێڕ).

فیرعەون خۆی بە خوای خەڵك دەزانی، بە ئـارەزوی خـۆی سـەریان دەبـڕێ و بەئارەزوی خۆی ئازادیان دەکا!

وەك خاوەنی مەڕ و بزنان کە بە ئارەزوی خۆی سەریان دەبڕێ.

جەندرمە بە وڵاتی میسردا بڵاوبونەوە و گشت شـوێنێکیان دەپـشکنی، لـە هەر شوێنێ منداڵێکی نەوەی ئیسرائیلی لە دایك ببوایە دەیانهێنـا وەك بـزن و مەڕ سەریان دەبڕی.

گورگ لە دارستانەکان بە ئازادی دەژیان، مار و دوپشك لـە شـاران جـرت و فرتیان بو، نەدەگیران و نەدەکوژران.

کەچی کوڕیژگەی[1] نەوەی ئیسرائیلی بۆی نەبو لە وڵاتی فیرعەوندا بژی!

بەمجۆرە بە هەزاران کوڕ و کوڕیژگە لەبەر چاوی دایك و باوکان سەریان بڕا.

ئەو ڕۆژەی لە نەوەی ئیسرائیل کوڕێك لە دایك دەبو، ڕۆژێکی سەخت و ڕەش بو، ڕۆژێکی پڕ لە خەم و گریان بو.

ئـەو ڕۆژەی لەنـەوەی ئیـسرائیلدا کوڕێـك لـە دایـك دەبـو ڕۆژی پرسـەو سەرەخۆشی بو.

هەمو ڕۆژێ وەك جەژنی قوربان کە بە سەدان مەڕ و بزن و چێڵ سەر دەبـڕێن، سەدان منداڵی نەوەی ئیسرائیل سەر دەبڕان.

فیرعەون لە خۆبایی ببو، خۆی لەسەر خەڵکی کردبوە خوا، خەڵکەکەی پارچە پارچە کردبو، نـەوەی ئیـسرائیلی دەچەوسـاندەوە و کوڕەکـانی سـەر دەبـڕین و کـچەکانی بـۆ خزمـەتکاری دەهێـشتەوە، بەڕاسـتی فیرعـەون خراپـەکارێکی ئاژاوەگێڕ بو.

---

(١) کوڕیژگە: کوڕی بچکۆڵە.

## ٦- لەدایکبونی موسا

خوا ویستی وابو ئەو شتەی فیرعەون لێی دەترسا و خۆی لـێ دەپاراست بێتە دی.

ئەو کوڕەی کە خوا دەیویست تەخت و تاراجی فیرعەون وەرگەڕێنێ لە دایـك بو.

ئەو کوڕەی کە خوا دەیویست خەڵك لە مرۆڤپەرستیەوە بـەرەو خواپەرسـتی ڕزگار بکا لە دایك بو.

ئەو منداڵەی کە خوا دەیویست خەڵك لە تاریکستانی بۆ ڕوناکی بپەڕێنێتەوە لە دایك بو.

موسای کوڕی عیمران لە دایـك بـو هـەر چـەندە فیرعـەون و سـەربازەکانی نەیاندەویست.

موسا سێ مانگان ژیا هەرچەندە جەندرمـەکان شـەو و ڕۆژ لـە دیـدەوانی[1] دابون.

## ٧- لەناو روباری نیلدا

بەڵام دایکی موسا ترسی کەوتە دڵ نەخۆ کوڕە جوانەکەی سـەر بـبڕن، چـۆن نەترسێ کە دوژمنانی کوڕان هەمیشە چاو دەگێڕن؟

چۆن نەترسێ کە جەندرمەکان بە دەیان کوڕیان لە ئامێزی دایکان ڕفانـدوە و سەریان بڕیون.

---

(١) دیدەوانی: چاودێری.

دایکی داماو و قوڕبەسەر[(١)] چ بکا؟

کوڕە جوانەکەی لە کوێ بشارێتەوە؟

جەندرمەکان وەك قەلەڕەش چاو دەگێڕن و وەك مێرولان بۆن دەکەن!

لێرەدا خوا فریای دایکی داماو و قوڕبەسەر کەوت و ئیلهامی خستە دڵی کە منداڵەکەی لەناو سندوقێك دابنێ و بیخاتە ناو روباری نیلەوە.

الله أکبر! دایکی بەسۆز چۆن منداڵەکەی دەخاتە ناو سندوق و فڕێـی دەداتـە ناو روباری نیل؟!

کێ لەناو ئەم سندوقەدا شیری دەداتێ!

چۆن لەناو سندوقدا دەتوانێ هەناسە هەڵمژێ؟!

دایکی بەسۆز هەمو ئەم پرسیارانەی بەخەیاڵدا هات بـەڵام پـشتی بـە خـوا بەست و متمانەی کردە سەر سروشی[(٢)] خوا.

هیچ خانوێك لە سندوق باشتر نیە منداڵەکەی بپارێزێ!

جەندرمە لە هەمو شوێنێ هەست و خوسـتیان ڕاگرتـوە، دوژمنـانی کـوڕان هەمیشە دانوساون.

جەندرمەکان بە چاوی قەلەڕەشەوە دەڕوانن و بە بۆنی مێرولان بۆن دەکەن.

دایکی داماو و قوڕبەسەر فەرمانەکەی خوای جێبەجێ کرد، کوڕە جوانەکەی خستە ناو سندوقێك و بە روباری نیلی دادا.

---

(١) قوڕبەسەر: بێچارە.

(٢) سروش: نیگا، وەحی.

دایکی بەسۆز و بەکوڵ لەوە دەترسا کوڕە جوانەکەی نقوم ببێ و بخنکێ، بەڵام پاشان ئارامی گرت و پشتی بە خوا بەست.

خوا دەفەرموێ: سروشمان خستە دڵـی دایکـی موسـا و فـەرمانمان پێکـرد و گوتمان: شیری بدێ و بەخێوی بکـە، ئەگـەر ترسـای جەندرمـەکان بیدۆزنـەوە و سەری ببڕن بە روباری نیلی دابدە، مەترسێ و غەمگین مەبە، چونکە ئێمە بـۆتی دەگەڕێنینەوە، کە گەورەش بو دەیکەینە پێغەمبەر.

## ٨- لەکۆشکی فیرعەوندا

فیرعەون زۆر کۆشك و تەلاری لە کەناری روباری نیلدا بنیات نابو.

هەر ڕۆژەی لە کۆشکێ ڕایدەبوارد، بۆ سەیران و خۆشی لە کەناری نیلدا ڕۆژی بەسەر دەبرد.

ڕۆژێکیان بۆ سەیران و خۆشی لە لێـواری نیـل دانیـشتبو، سـەیری ڕوبـاری دەکرد کە بە ژێر پێیدا دەڕۆیی.

فیرعەون شاژنەکەشی لەگەڵدا بو شاژنیش سەیری زێی دەکرد.

فیرعەون و شاژنەکەی بەیەکەوە بە دڵخۆشی دانیشتبون و لە روبـاری نیلیـان دەڕوانی.

لە ناکاو چاویان بە سندوقێکی دور کەوت شەپۆڵەکانی نیل یارییان پێدەکرد و دەتگوت ماچی دەکەن.

شاژن گوتی: گەورەم! ئەو سندوقە دەبینی؟

گوتی: کوانێ؟. سندوق لەناو روباری نیل چ دەکا؟ ڕەنگە تەختە دارێك بێ کەوتبێتە ناو نیلەوە.

شاژن گوتی: نەخێر گەورەم سندوقە!

سندوقەکە نزیك کەوتەوە.

خەڵکەکە گوتیان: بەڵێ گەورەم! سندوقە!

پاشا فەرمانی بە یەکێك لە نۆکەرەکانی کرد بیهێنێ.

نۆکەرەکە چوە ناو نیل و سندوقەکەی هێنا!

سندوقەکەیان کردەوە دیتیان منداڵێکی زۆر جوانی تێدایە و پێدەکەنێ.

خەڵکەکە سەریان سوڕما و منداڵەکەیان لە یەکتری وەردەگرت و تەماشایان دەکردێ.

فیرعەون سەری سوڕما و تەماشای دەکردێ.

هەندێ لە نۆکەرەکان گوتیان:

ئەم منداڵە منداڵێکی نەوەی ئیسرائیلە دەبێ پاشا سەری ببڕێ.

شاژن کە منداڵەکەی بینی خۆشی ویست و لە باوەشی گرت و ماچی کرد.

لە پاشا پاڕایەوە و گوتی:

توخوا مەیکوژە، دڵی من و تۆی پێ خۆش دەبێ.

بەڵکو سودی لێ دەبینین یان دەیکەینە کوڕی خۆمان.

بەجۆرە موسای کوڕی عیمڕان چوە ناو کۆشکی فیرعەون وسەری نەبڕا و نەمرد و ژیا، هەرچەندە فیرعەون و جەندرمەکانی دەیانویست بیکوژن.

جەندرمەکان نەیانتوانی ئەم کوڕە ئیسرائیلیە بدۆزنەوە هەرچەندە وەك قەلەڕەش چاویان دەگێڕاو وەك مێرولان بۆنیان دەکرد.

خوا ویستی وابو فیرعەون کە دوژمنی کوڕان بو کوڕێکی وا بەخێو بکا، کە تەخت و تاراجەکەی بە دەستی وی لەناو دەچێ.

داماو فیرعەون! نەیزانی ئەم کوڕە موسایە و بە هەڵەدا چو.

هامانی وەزیر و سەربازەکانیشی نەیانزانی ئەم کوڕە موسایە و بە هەڵەدا چون.

## ٩٠- کێ مەمکی دەداتێ؟

منداڵە تازەکە، منداڵە جوانەکە ببوە گەمە و یاری ناو کۆشك و ماڵی فیرعەون.

هەمو هەڵیاندەگرت و ماچیان دەکرد، هەمو خۆشیان دەویست و پێیان هەڵدەگوت[1]، چونکە شاژن پڕ بە دڵ خۆشی دەویست.

مادەم شاژن خۆشی بوێ، چۆن خانمانی ناو کۆشك خۆشیان ناوێ؟! چۆن نۆکەرانی کۆشك خۆشیان ناوێ؟!

هەمو هەڵیاندەگرت و ماچیان دەکرد، چونکە منداڵێکی جوان بو.

شاژن داوای دایەنێکی[2] کرد شیر بداتە منداڵەکە.

دایەنێك هات و منداڵەکەی وەرگرت.

(١) پێهەڵگوتن: مەدحکردن.
(٢) دایەن: ئەو ژنەی کە شیر بە منداڵان دەدا.

بەڵام منداڵەکە دەگریا و لەلای دایەنەکە گیر[1] نەدەبو.

شاژن داوای دایەنێکی تری کرد.

ئەویش هات و منداڵەکەی وەرگرت، بەڵام منداڵەکە دیسان گریا و گیر نەبو.

دایەنی سێیەم و چوارەم و پێنجەمیش هاتن بەڵام منداڵەکە هەر دەگریا و گیر نەدەبو.

سەیرە! ئەم منداڵە لەبەرچی مەمك ناگرێ؟ لەبەر چی دەگریێ؟

دایەنەکان زۆریان هەوڵدا مەمکی پێ بگرن تا شاژن دڵی خۆش بێ و خەڵاتیان بکا.

بەڵام خوا شیری ئافرەتێکی تری لێ حەرام کردوە چۆن شیری تر دەخوا؟

منداڵەکە ببوە قسە و باسی نێو کۆشکی پاشا و هەموی خەریك کردبون.

بەیەکتریان دەگوت: ئەرێ خوشکم ئەتۆ منداڵەکەت بینیوە؟

بەڵێ بینیومە منداڵێکی تا بڵێی جوانە.

بەڵام سەیرە وەك منداڵانی تر نیە! شیری هیچ دایەنێك ناخوا.

ئەگەر بێتو دایەنێك وەریگرێ و بیەوێ شیری بداتێ دەگریێ و لەلای گیر نابێ و شیرەکەی ناخوا!

چەند بەستەزمانە، ئەگەر ئاوا بمێنێتەوە ناژی، دەمرێ!

بەڵێ، بەمجۆرە چەند ڕۆژێك تێپەڕین و منداڵەکەش شیری هیچ دایەنێکی نەخوارد.

---

(١) گیر نەبو: نەسرەوی.

## ١٠- لە باوەشی دایکیدا

دایکی بەسۆز بە خوشکی موسای گوت:

کیژم برۆ سۆراخی[١] براکەت بکە دەبێ زندو بێ و مابێ.

خوا بەڵێنی پێداوم بیپارێزێ و بۆمی بگەڕێنێتەوە.

خوشکی موسا چو سۆراخی براکەی بکا.

گوێی لەخەڵك بو باسی منداڵێکی جوانی ناو کۆشکی پاشایان دەکرد.

چوە لای کۆشکی پاشا و گوێی لە باسوخواسی خانمانی ناو کۆشك گرت دەیانگوت:

ئەرێ ئەو دایەنەی شاژن لە شاری (ئەسوان)ی داوا کردبو هات؟

خانمێك گوتی: بەڵێ هات بەڵام منداڵەکە مەمکی ئەویشی نەگرت و شیری ئەویشی نەخوارد.

بەڕاستی سەیرە! ئەو منداڵە دەبێ چی بێ؟ وا بزانم ئەوە شەشەمین دایەنە شاژن تاقی بکاتەوە!

بەڵێ بەڵێ دەیانگوت دایەنێکی زۆر پاك و خاوێنیشە و هەمو منداڵێکیش شیری خواردوە!

خوشکی موسا گوێی لەم باسوخواسانە بو، بە نەرمی و بە ئەدەبەوە پێی گوتن:

من ئافرەتێك لەم شارەدا دەناسم بێگومانم کە منداڵەکە مەمکی دەگرێ و شیری دەخوا.

---

(١) سۆراخ: بەدواداگەڕان.

خانمێك گوتی: من بڕوا ناكەم شیری ئەویش بخوا، چونكە ئەوە شەشەم دایەن بو كە تاقیمان كردۆتەوە، كەچی شیرەكەی ئەویشی نەخواردوە.

خانمێكی تر گوتی: چی تێدایە با حەفتەمیش تاقیبكەینەوە.

هەواڵ گەیشتە لای شاژن، شاژن كەنیزەیەكی بانگ كرد و گوتی: لەگەڵ ئەم ئافرەتە بڕۆ دایەنەكە بێنن.

دایكی موسا هات، نۆكەرێك منداڵەكەی هێنا و دایە دەستی.

منداڵەكە خۆی لە ئامێزی ئەم دایەنە مات كرد و مەمكی گرت و شیرەكەی خوارد، دەتگوت دەمێكە چاوەڕێیە!

چۆن شیرەكەی ناخوا كە ئەم دایەنە دایكی خۆشەویست و بەسۆزی بێ؟

چۆن شیر ناخوا كە سێ ڕۆژە شیری نەخواردوە و برسییە؟!

شاژن سەری سوڕما، خانم و نۆكەرانی ناو كۆشك سەریان سوڕما، فیرعەون دڵی داخورپا و شێوا، گوتی:

بۆچی ئەم منداڵە تەنها شیری ئەم دایەنەی خوارد! دیارە دایكیەتی؟

دایكی موسا گوتی:

گەورەم من ئافرەتێكی بۆن خۆشم، شیرم پاكە و تامی خۆشە، هەمو منداڵێك مەمكم دەگرێ.

فیرعەون بەم وەڵامە كڕ و بێدەنگ بو و خەڵاتی كرد.

بەمجۆرە دایكی موسا گەڕایەوە ماڵەوە و موساشی لە باوەش بو.

خوا موسای بۆ گەڕاندەوە تا چاوی دایكی ڕون بێتەوە و بۆی غەمگین نەبێ، تا بزانێ بەڵێنی خوا دێتە دی، بەڵام زۆربەی خەڵك نازانن.

## ١١- بۆ كۆشكی فیرعەون!

پاش ئەوەی دایكی موسا موسای لە شیر كردەوە، بۆ كۆشكی پاشای گەڕاندەوە.

موسا لە كۆشكی پاشادا وەك كوڕە پاشایان گەورە بو.

موسا سامی پاشا و دەوڵەمەندانی لە دڵدا نەما.

موسا بە چاوی خۆی دەیدی فیرعەون و خزم و خێزانەكەی بە چ نازونوزێك ڕادەبوێرن.

دەیدی نەوەی ئیسرائیل توشی چ دەردەسەریەك كراون تا فیرعەون و خزم و خێزانی بە خۆشی ڕاببوێرن.

دەدیدی چۆن نەوەی ئیسرائیل برسی كراون تا سەگ و سوارەكانی فیرعەون تێر و تەژی بن.

دەیدی چۆن وەك كەر و هێستر ڕەفتار لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل دەكەن.

دەیدی چۆن بێگارییان[1] پێدەكەن و ئێش و ئازاریان پێدەچێژن.

موسا هەمو سبەینەیەك و ئێوارەیەك ئەم شتانەی دەدیت و بێدەنگ دەبو.

موسا زۆری پێ ناخۆش بو و ڕقی هەڵدەستا.

چۆن پێی ناخۆش نەبێ و ڕقی هەڵنەستێ كە ببینێ نەتەوە و بنەماڵەكەی ڕیسوا دەكرێن؟

كە نەتەوەكەی نەوەی پێغەمبەرانن، نەوەی بەڕێزان و پایەبەرزانن.

---

(١) بێگاری: كاری بە زۆری و بێ كرێ.

گوناهی نەوەی ئیسرائیل چیە؟

هەر چونکە قیبتی نین؟! هەر چونکە کەنعانین؟!

هەرگیز ئەمە گوناح نیە! هەرگیز ئەمە گوناح نیە!

## ١٢- مستێکی کوشندە

موسا کە گەورە بو و بوە گەنجێکی بەهێز خوا حوکم و زانستی پێبەخشی.

موسا ستەمکارانی خۆشنەدەویست و ڕقی لـێدەبونەوە، موسا ستـەمدیدە و بێکەسانی خۆشدەویست و یارمەتی دەدان، بێگومان گشت پێغەمبەران هـەر وا بونە.

جارێکیان موسا بە نـاو شـارەکەی فیرعەونـدا دەگـەڕا، خـەڵك هەریەکـەی بەکاری خۆی خەریك بو.

موسا دیتی وا دو کەس لەگەڵ یـەکتر بەشـەڕ دێـن، یـەکێکیان لـە نـەوەی ئیسرائیلە و ئەوەیتریش قیبتییە، قیبتیەکان دوژمنی نەوەی ئیسرائیل بون.

پیاوە ئیسرائیلیەکە هاواری کرد و بانگی موسـای کـرد یارمـەتی بـدات و، سکاڵای خۆی لە پیاوە قیبتیەکە دەربڕی.

موسا لە قیبتیەکە توڕە بو و مستێکی ڕاوەشاندێ، مستەکە کوشـندە بـو و قیبتیەکەی کوشت.

موسا زۆر پەشیمان بۆوە، چونکە زانی شەیتان ئەم کارەی پێکردوە.

موسا بۆ لای خوا ژیوان[1] بۆوە و داوای لیبوردنی لە خوا کرد.

---

(١) ژیوان بونەوە: پەشیمان بونەوە.

هەمو پێغەمبەرێك بەرەو لای خوا ژیوان دەبێتەوە و داوای لێبوردن دەکات.

موسا داوای لێبوردنی کرد و گوتی:

شەیتان ئەم کارەی پێکردم، شەیتان دوژمنێکی گومڕاکەرە.

خوا لە موسای بوری، چونکە موسا بە مەبەستی کوشتن مستەکەی ڕانەوەشاند، هەر مەبەستی ئەوەبو لێیبدا، بەڵام مستەکە بەهێز بو کوشتی.

موسا سوپاسی خوای کرد و گوتی:

خوا میهرەبانیی لەگەڵدا کردم و لێم خۆش بو، کەواتە لەمەودوا قەت نابمە پاڵپشتی تاوانکاران.

موسا لە ترسی جەندرمەکانی فیرعەون نەخۆ بێن و بیگرن بە ماتەمات و بە وریاییەوە لەناو شاردا دەڕۆیی.

موسا ئاگاداری خۆی دەبو و لەوە دەترسا جەندرمە بیگرن و بۆ لای فیرعەونی ببەن.

جەندرمە هاتن دیتیان وا پیاوێکی قیبتی کە یەکێك بو لە نۆکەرەکانی فیرعەون لەسەر ئەرز کەوتوە و کوژراوە، بە دوای بکوژەکەیدا گەڕان بەڵام نەیاندۆزیەوە.

کێ بکوژیان نیشان دەدا کە جگە لە موسا و پیاوە ئیسرائیلیەکە کەسی تر پێی نازانی؟!

لەم شار و وڵاتەدا باس هەر باسی ئەم کوژراوە بو، هەمو کەسێ باسی دەکرد و کەسیش نەیدەزانی بکوژەکە کێیە.

فیرعەون توڕە بو و بە جەندرمەکانی گوت:

هەر دەبێ بکوژم بۆ بدۆزنەوە.

## ١٣- نهێنیەکە ئاشکرا دەبێ

بۆ سبەینێ موسا دیتی هەر هەمان پیاوی ئیسرائیلی وا لەگەڵ قیبتیەکی تر بەشەڕ دێ.

ئیسرائیلیەکە بێئەوەی شەرم لە خۆی بکاتەوە ئەم جارەش هاواری کرد و بانگی موسای کرد یارمەتی بدا.

موسا پێیگوت: تۆ دیارە پیاوێکی زۆر هیچ و پوچ و بێشەرمی و واز لە شەڕ و مشتومڕان ناهێنی، هەر بانگی منیش دەکەی یارمەتیت بدەم

دەتەوێ لەسەرت وەدەنگ بێم و سەرت بخەم هەی تاوانبار!

هەرچەندە موسا ئەم قسانەی بە پیاوە ئیسرائیلیەکە گوت، بەڵام ویستیشی قیبتیەکە تەمبێ بکا، بەم مەبەستە لێیان چوە پێش و نزیك کەوتەوە.

ئیسرائیلیەکە بینی موسا توڕە بوە و سەرکۆنەی[1] دەکا، لەوە ترسا موسا لەویش بدات و وەك قیبتیەکەی دوێنێ بیکوژێ.

بۆیە گوتی: ئەی موسا! دەتەوێ وەك دوێنێ یەکێکت کوشتوە ئەمڕۆ منیش بکوژی.

دیارە دەتەوێ دەستی ستەمکاریت درێژ بکەی و کاری چاك ئەنجام نەدەی.

لێرەدا قیبتیەکە زانی کە موسا پیاوکوژەکەی دوێنێکەیە.

قیبتیەکە چو بە جەندرمەکانی ڕاگەیاند و گوتی موسا پیاوکوژەکەیە.

هەواڵ گەیشتەوە لای فیرعەون، فیرعەون توڕە بو و گوتی:

ئەو کوڕەی کە لە کۆشکی من گەورە بوە و نمەکی منی کردوە کوشتویەتی؟!

---

(١) سەرکۆنە: گلەیی، سەرزەنشت.

بەڵام خوا ویستی وابو موسا لە بەڵای فیرعەون و جەندرمەکانی ڕزگار بکا و نەکەوێتە بەردەستیان.

موسا مستەکەی بە مەبەستی کوشتن ڕانەوەشاند بو بەڵام مستەکە بەهێز بو و قیبتیەکەی کوشت.

بەڵام فیرعەون و جەندرمەکان بەم شتە بڕوا ناکەن و پاساو[1] لە موسا قبوڵ ناکەن.

خوا ویستی وابو پاشایەتی فیرعەون بە دەستی موسا تێبچێ.

خوا ویستی وابو نەوەی ئیسرائیل بە دەستی موسا ڕزگار بن.

خوا وای خەملاندوە[2] موسا خەڵك لە مرۆڤپەرستیەوە بەرەو خواپەرستی رزگار بکات.

بەڵام ئەگەر موسا دەستی جەندرمە ستەمکارەکانی بگاتێ چۆن ئەم مەبەستانە دێنە دی؟

دەست و پێوەند و وەزیرەکانی فیرعەون کۆبونەوە و ڕاوێژیان لەناو خۆدا کرد و ویستیان موسا بکوژن.

پیاوێك هەبو گوێی لە گشت پلان و قسەکان بو.

هاتە لای موسا و باسوخواسی تێگەیاند و پێیگوت:

بۆ تۆمە تا زوە خۆت ڕزگار بکە.

موسا بەنهێنی و بەترس و وریاییەوە شاری بەجێهێشت و لە خوا دەپاڕایەوە، دەیگوت: خوایە لەم ستەمکارانە رزگارم بکە.

---

(١) پاساو: هۆی عوزرئامێز.

(٢) خەملاندن: تەقدیرکردن.

## ١٤- لەمیسرەوە بەرەو مەدیەن

بەڵام موسا بۆ کوێ بچێ، سەرتاپای وڵاتــی میــسر هــی فیرعەونــە و لــەژێر دەسەڵاتی فیرعەون دایە ؟!

جەندرمەکانی فیرعەون هەمیشە دانوساون، بەچاوی قەلەڕەش سەیر دەکەن و بە بۆنی مێرولان بۆن دەکەن!

خوا ئیلهامی خستە ناو دڵـی موسـا بـچێتە شـاری مەدیـەن کـە شـارێکی عەرەبی بوو دەسەڵاتی فیرعەونی نەگەیشتبوێ.

مەدیــەن دەشــتێك بــو گەلــێ گوندیــشی لێبــو، شارســتانیەتی میــسری نەگەیشتبوێ.

کۆشك و تەلار و بازاڕی میسری نەگەیشتبوێ.

بەڵام ئاواییەکی بەختەوەر بون، چونکە لە دەسەڵاتی فیرعەون دور بو.

بەختەوەر بون چونکە وڵاتێکی سەربەست بو لەژێر حوکمی فیرعەون دانەبو.

چەند خۆشە دەستەکیاتی لەگەڵ ئازادی و دادگەری.

چەند ناخۆشە شارستانیەتی لەگەڵ کۆیلەیی و ژێردەستەیی.

لە مەدیەن کە خەڵك رۆژیان دەکردەوە لــە زەبــروزەنگ و ســتەمی فیرعــەون نەدەترسان.

لە مەدیەندا کە خەڵك دەنوستن لە بەڵای جەندرمەکانی فیرعەون نەدەترسان، لە مەدیەندا منداڵ سەر نەدەبڕان.

موسا بەرەو مەدیەن کەوتە ڕێ.

لە وڵاتی میسر چوە دەرێ و دور کەوتەوە، بەڵام دەترسا و ئاوڕی بەملا و ئەولا دەدایەوە، نەوەك یەکێك شونی[١] هەڵگرتبێ.

بەڵام جەندرمەکان بێئاگابون.

موسا ناوی خوای لێهێنا و دەرچو، لە خوا دەپاڕایەوە و داوای دەکرد یارمەتی بدات و ڕزگار ببێ.

کە بەرەو مەدیەن کەوتە ڕێ گوتی: بە تەمای خوا، خوا ڕێی بێزیانم نیشان دەدا.

## ١٥- لە مەدیەندا

موسا گەیشتە مەدیەن، کەسی نەدەناسی و کەسیش ئەوی نەدەناسی.

شەوێ بچێتە کوێ؟ لە کوێ بنوێ؟

موسا بیری لەم پرسیارانە دەکردەوە، بەڵام لەوە دڵنیا بو کە خوا سەرگەردانی[٢] ناکات.

لەم شارەدا بیرێك هەبو خەڵك ئاویان لێ هەڵدەگۆزی[٣] و مەڕ و ماڵات و وڵساتیان پێ تێراو دەکرد.

موسا دو ئافرەتی دیت مەڕ و ماڵاتەکەیان لە دورەوە ڕاگرتوە و چاوەڕێ دەکەن خەڵکەکە مەڕ و ماڵاتی خۆیان ئاو بدەن ئینجا ئەوان ئاوی بدەن.

---

(١) شون: شوێنەوار، شوێنپێ.

(٢) سەرگەردان: وێڵ، ڕێ لەبەربزربو.

(٣) ئاو هەڵگۆزین: ئاو دەرهێنان لەبیر.

موسا خاوەنی دڵێکی میهرەبـان و بەبـەزەیی بـو، وەك بـاوکێکی بەسـۆز و دلۆڤان[1] هەستی بزوا.

بە ئافرەتەکانی گوت: بۆچی وا لە دورەوە وەستاون و ئاو ناهێنن؟

گوتیان: تا هەمو خەڵکەکە ئاو هەڵنەگۆزن ئێمـە نـاتوانین ئـاو هـەڵگۆزین، چونکە ئەوان بەهێزن و ئێمە بێهێزین، ئەوان پیاون و ئێمە ئافرەتین.

وەك بڵێی بزانن موسا لێیان بپرسێ ئەی بۆچی لە ماڵەوە پیاوێکتان بەم کارە هەڵناستێ؟

بۆیە گوتیان: باوکیشمان پیرێکی بە تەمەنە.

لێرەدا موسا سۆزی میهرەبانێتی وروژا، خۆی چو ئاوی بۆ هەڵگۆزین، پاشان ئەوان ڕۆیشتن.

بەڵام موسا بۆ کوێ بچێ؟!

ئەم شەو ڕو لە کوێ بکا و لە کوێ بنوێ؟!

نە ئەو کەس دەناسێ نە کەسیش ئەو دەناسێ!

پاشان چوە بەر سێبەری دارێك و گوتی:

خوایە پێویستیم بە شوێنێکە تێیدا نیشتەجێ بم.

---

(١) دلۆڤان: دڵنەرم و بە بەزەیی.

## ١٦- بەدوادا ناردن

هەردو کچەکە پێش کاتی دیاریکراوی ڕۆژانەیان گەیشتنەوە ماڵێ.

باوکەکەیان لێی پرسین: ها کچەکانم چۆنە ئەمڕۆ وا بەزوویی گەڕانەوە؟ هۆی چبو وا بە خێرایی هاتنەوە؟

گوتیان: خوا وای ڕێکخست پیاوێکی چاك و بە بەزەییمان لێ هەڵکەوت و ئاوەکەی بۆ هەڵگۆزین.

پیاوە پیرەکە سەری سوڕما، زانی ئەم پیاوە پیاوێکی نامۆیە، چونکە هیچ ڕۆژێك کەس میهرەبانی لەگەڵدا نەکردون.

پیاوە پیرەکە گوتی: پیاوەکەتان لەکوێ بەجێهێشت؟

گوتیان: لە هەمان شوێن، پیاوێکی نامۆیە هیچ شوێنێکی نیە!

پیاوە پیرەکە گوتی: کچەکانم کارێکی چاکتان نەکرد، دەبوایە مێوانداری بکەن، چونکە ئەو چاکەی لەگەڵ ئێمەدا کردوە، شوێنیشی نیە ڕوی تێبکا.

ئەم شەو ڕو لە کوێ بکا و لە کوێ بنوێ؟!

لەسەرمانە میوانداری بکەین، لەسەرمانە چاکەی بدەینەوە!

یەکێکتان بڕۆن بیهێنن.

یەکێکیان بە ڕۆیشتنێکی شەرمنانەوە چوە لای موسا و پێی گوت: باوکم بانگت دەکا تا پاداشتی ئاو هەڵگۆزینەکەت بداتەوە.

موسا زانی خوا نزاکەی قبوڵ کردوە و شوێنی نیشتەجێی بۆ ڕەخساندوە، بۆیە داواکەی ڕەت نەکردەوە.

موسا لەگەڵی چو، موسا زۆر بەڕێز و بە حورمەتەوە لـە پێـشەوەی کـچەکە دەڕۆیشت تا توشی نەزەر نەبـێ.

موسا گەیشتە ماڵەکە و پیاوە پیرەکە لە نـاو و نیـشتمانی موسـای پرسـی، ئەویش وەڵامی دایەوە.

پاشان موسا بەسەرهات و بارودۆخەکەی بۆ گێڕایەوە.

پیاوە پیرەکە بە هێمنی و بە ئارامی گوێی بۆ گرتبو.

کە موسا لە گێڕانەوەکەی بوەوە پیاوە پیرەکە پێی گوت:

مەترسە لەم نەتەوە ستەمکارە ڕزگارت بو.

## ١٧- ژن هێنان

موسا وەك میوانێکی بەڕێز بـەڵکو وەك کـوڕێکی خۆشەویـست لـە لایانـدا مایەوە.

ڕۆژێکیان یەك لە کچەکان بە سادەیی بە دڵپاکی بە باوکی گوت:

بابە گیان! بەکرێ کاری پێبکە، موسا پیاوێکی بەهێز و پاکە.

باوکی گوتی: کچم چۆن دەزانی بەهێز و پاکە؟

گوتی: دەزانم بەهێزە، چونکە ئەو بەتـەنیا سـەری بیرەکـەی هـەڵگرت، کـە بەچەند کەسێك نەبێ هەڵناگیرێ.

بابەگیان پاکیشە، چـونکە بـە درێـژایی ڕێگـا لـە پێـشە مـن دەڕۆیـشت و تەماشای نەدەکردم.

هەمو کرێکار و خزمەتکارێ دەبێ بەهێز و پاك بێ.

ئەگەر بەهێز نەبێ بە باشی کاری پێناکرێ.

ئەگەر پاك نەبێ گزی[1] دەکا و هێزەکەی سودی نابێ.

وتەی کچەکە لەگەڵ دڵی باوکە پیرەکەی تێکی کردەوە.

بەڵام ئەو وەك باوکێك بیری لە مەسەلەکە کردەوە.

باوکە پیرەکە لە دڵی خۆیدا گوتی:

پێموایە کەس لەم کوڕە شایستەتر نیە بیکەم بە خزمی خۆم.

بڕوا ناکەم لە دنیادا کەسێکی لەم گەنجە باشتر بدۆزمەوە!

لە مەدیەندا هیچ کەسێك بە شایستە نازانم بیکەم بە خزمی خۆم!

ڕەنگە خوا ئەم گەنجەی بۆ هێنابم تا بیکەم بە خزم و هاریکاری خۆم.

پیاوە پیرەکە بە ڕێز و بەزەیی و داناییەوە بە موسای گوت:

من دەمەوێ کچێکی خۆمت لێ مارە بکەم، بەڵام دەبێ هەشت ساڵان کاروبارم بۆ ڕاپەڕێنی.

مارەییەکە بەم جۆرەیە، کە دەبێ ئەم هەشت ساڵە تەواو بکەی.

خۆ ئەگەر کردتە (دە) ساڵ لە چاکە و پیاوەتی خۆتە، نامەوێ کاری سەختت پێبکەم، بە پشتیوانی خوا چاکەت لەگەڵدا دەکەم.

پیاوە پیرەکە لەوە دەترسا گەنجەکە کچەکەی ببات و بە تەنیایی بەجێی بێڵێ.

پیاوە پیرەکە ویستی گەنجەکە تاقی بکاتەوە تا ئەگەر کەوتە بەردڵی کچەکەی بداتێ.

---

(١) گزی: خیانەت.

موسا داواکەی قبوڵ کرد و پێیوابو خوا وای بۆ ڕێك خستوە و خوا پیرۆزی دەکا.

پێیوابو خوا وایکردوە بچێتە مەدیەن و لەوێش بچێتە ماڵی ئەم پیاوە پیرە و پیاوە پیرەکەش سۆز و خۆشەویستی بۆ بزواوە.

بۆیە موسا گوتی: من ڕازیم.

بەڵام موسا زیرەك و تێگەیشتو بو بیری کردەوە نەوەك لە ئایندەدا توشی بێزاری ببێ بۆیە ویستی لە هەڵبژاردنی هەردو ماوەکەدا سەربەست بێ و گوتی:

جا ئەگەر هەشت ساڵ کارم بۆ کردی یان دە ساڵ من خۆم ئازادم، خواش ئاگادارە.

## ١٨- بەرەو میسر

موسا ماوەکەی تەواو کرد و لەگەڵ خێزانەکەی بەڕێ کەوتن.

خواحافیزیان لە پیاوە پیرەکە کرد و پیاوە پیرەکەش خواحافیزی لێکردن و نزای[1] بۆ کردن و گوتی:

برۆ خوات لەگەڵ کوڕی خۆم، برۆ خوات لەگەڵ کچی خۆم.

موسا لەگەڵ خێزانەکەی بەڕێ کەوت، شەو یەك پارچە تاریکی بو، گەلێ سارد و سەرما بو.

بەڵام لەم بیابانەدا ئاگر لە کوێ پەیدا دەبێ؟

---

(١) نزا: دوعای چاك.

ئەگەر ئاگر نەدۆزنەوە چۆن خۆیان گەرم بکەنەوە؟!

ئەگەر ڕوناکی نەدۆزنەوە چۆن بە ڕێگادا بڕۆن؟!

بەڕێگادا دەڕۆیشتن و موسا چاوی بۆ ئاگر دەگێڕا.

لەناکاو ئاگرێکی لە دورەوە بینی، بەخێزانەکەی گوت:

لێرە بن، ئاگرێکم لە دورەوە دیوە دەچم بەڵکو هەندێکی لێ دێنم یان ئاوەدانیەکی لەلادا دەدۆزمەوە.

موسا بەرەو لای ئاگرەکە ڕۆیشت.

کە گەیشتە ئەوێ بانگێ کرا: ئەی موسا من پەروەردگارتم، کەوشەکانت[١] داکەنە، تۆ لە دۆڵی پیرۆزی گوای.

خوا لەوێدا قسەی لەگەڵ موسادا کرد و سروشی بۆ هەنارد و فەرموی:

ئەی موسا من تۆم بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵبژاردوە، گوێ بۆ سروشم ڕادێرە، من خوام، جگە لە من هیچ خواوەندێکی تر نیە، من بپەرستە و نوێژان بکە تا منت بە یاد بێ، ڕۆژی دواییش ڕەوایە و ڕو دەدات.

موسا گۆچانێکی بە دەستەوە بو، لە کاتی ڕۆیشتندا تاقەتی خۆی دەدایە سەری.

خوا فەرموی: موسا ئەو دارەی لە دەستی ڕاستت گرتوە چیە؟

موسا زۆر بە سادەییەوە گوتی: گۆچانەکەمە.

موسا دەستی پێکرد سودەکانی گۆچانەکەی دەژمارد، دەیویست قسەکانی درێژ بێ چونکە قسەی لەگەڵ خوادا دەکرد و گوتی:

(١) کەوش: نەعل.

ئەم دارە گۆچانەکەمە، لەکاتی ڕۆیشتندا دەیدەمە بەرخۆم و بۆ مەڕ و ماڵاتەکەم گەڵای دارانی پێ هەڵدەوەرێنم، زۆر سودی تریشی لێ دەبینم.

خوا فەرموی: موسا گۆچانەکەت هەڵدە.

موسا هەڵیدا و گۆچانەکە بوە مارێکی زل و زەبەلاحی بە جولە جول.

خوا فەرموی: هەڵیگرەوە مەترسە، هەرئێستا دەیگێڕینەوە سەر شێوەکەی پێشوی.

خوانیشانەیەکی تریشی بەموسا بەخشی، کە ئەویش دەستی سپی و ڕۆشن بو.

فەرموی: ئەی موسا دەستت بخە ناو باخەڵت پاشان دەری بێنە بێئەوەی نەخۆشی بێ سپی و ڕۆشن دەبێ.

## ١٩- بڕۆ لای فیرعەون کە سنوری بەزاندوە و یاخی بوە

جا دوای ئەم گفتوگۆیە خوا فەرمانی بە موسا کرد بۆ ئەم کارەی کە لە پێناویدا وەدیهاتوە دەسبەکار بێ.

فیرعەون خۆی لەسەر خەڵکی کردبوە خوا، فیرعەون خراپەکاری لە وڵاتدا بەرپا کردبو.

نەتەوەی فیرعەون بەخوا بێبڕوا بون، نەتەوەی فیرعەون کاری خراپەیان لەسەر زەوی دەنایەوە.

خوا لە بەندەکانی ڕازی نابێ بێبڕوا بن، خوا حەز ناکا کاری خراپە لەسەر زەوی بڵاوبێتەوە.

خوا ویستی موسا بنێرێتە لای فیرعەون و نەتەوەکەی چونکە نەتەوەیەکی دور لە خوا و خراپەکار بون.

بەڵام موسا چۆن بچێتە لای فیرعەون و چۆن ڕوبەڕوی ئەم سەرسەختە بە زەبروزەنگە ببێتەوە.

موسا لەمێژ نیە پیاوێکی قیبتی کوشتوە!

موسا لە میسر بە ترس و لەرزەوە هەڵاتوە و جەندرمەکان و خەڵکی کۆشک دەیناسنەوە!

موسا گوتی: خوایە من پیاوێکم لێ کوشتون دەترسم بمکوژنەوە.

هەروەها زمانیشم دەگیرێ.

بەڵام خوا ئەمانەی دەزانی، خوا دەیویست موسا بچێ ئەگەرچی پیاویشی لێ کوشتبن و زمانیشی بگیرێ.

خوا بانگی کرد: ئەی موسا بڕۆ بانگی ئەم نەتەوە ستەمکار و بێبڕوایە بکە تا بۆ لای خوا بگەڕێنەوە.

موسا گوتی: خوایە لەوە دەترسم بڕوام پێ نەکەن، لەوەش دەترسم کاتێک بمەوێ قسەیان لەگەڵ بکەم هەناسەم سوار ببێ و زمانم نەبێتەوە، بۆیە با (هارون)یشم لەگەڵدا بێ.

خوایە کەسێکم لێ کوشتون دەترسم بمکوژنەوە.

خوا فەرموی: نەخێر ناتکوژنەوە و هەردوکتان بڕۆن، من ئاگام لێتانە و گوێم لە گفتوگۆتانە.

بڕۆنە لای فیرعەون و پێی بڵێن:

ئێمە پێغەمبەری خوای بونەوەرین.

نەوەی ئیسرائیل ئازاد بکە و لێگەڕێ با لەگەڵ ئێمەدا بن.

خوا فەرمانی بە موسا و بە هارون کرد بە نەرم و نیانی لەگەڵ فیرعەون بدوێن.

خوا لەگەڵ دوژمنەکانیشی تارادەیەك نەرمی پێخۆشە.

خوا فەرموی: قسەی نەرمی لەگەڵدا بکەن بەشکو بیردەکاتەوە یا دەترسێ.

## ٢٠- لەبەردەم فیرعەوندا

موسا و هارون چونە لای فیرعەون و لە کۆڕی فیرعەون داوایان لە فیرعەون کرد تا بەرەو خوا بگەڕێتەوە.

بەڵام فیرعەونی بە زەبروزەنگ لە چاونەترسیەکەی موسا تورە بو، بە کەشوفش و لوتبەرزیەوە گوتی:

گەنجۆ[1]! تۆ کێی تا بتوانی لە کۆڕی من هەڵستیەوە و ئامۆژگاری من بکەی؟

تۆ ئەو منداڵە نەبوی کە لە ناو زێدا هەڵمانگرتیەوە؟

ئەدی ئێمە نەبوین لە منداڵی تا گەنجێتی بەخێومان کردی؟

تۆ نەبوی پیاوەکەت کوشت و خۆت دزیەوە؟

موسا تورە نەبو، نەیگوت: درۆیە، نەیگوت ڕاست ناکەی، بڕوبیانوی نەهێنایەوە، بەڵکو زۆر بە ڕاشکاویەوە وەڵامی دایەوە.

---

(١) گەنجۆ: ئەی گەنج.

گوتی: بەڵێ من کوشتم، کارێکی ناڕەواش بو بەڵام ژیوان بومەوە و خوا لـێم خۆش بوە.[١]

پاشان کە ترسام بمکوژنەوە هەڵاتم و وڵاتم بە جێهێشت.

پاشان خوا چاکەی لەگەڵدا کردم و کردمیە پێغەمبەر.

ئەی فیرعەون! منەتی ئەوەم لەسەر دەکەی، کە چەند سـاڵێك منـت بـەخێو کردوە؟!

ئەدی بۆ بیر لەوە ناکەیەوە کە بۆچی من کەوتمە بەردەستی تۆ و لەبەر چ منت بەخێو کردوە؟

ئەگەر تۆ منداڵت نەکوشتبایە دایکیشم فڕێی نەدەدامە ناو نیل و نەدەکەوتمە بەردەستی تۆ تا بەخێوم بکەی!

لە پاڵ ئەم هەمو ستەم و کارە خراپانەتدا پێتوایە پیاوەتیت لەگەڵدا کردوم؟

تۆ نەتەوەکەی منت بە کەر و ئاژەڵ داناوە و وەك سەگ تێتخوڕیـون، توشـی نەهامەتی و دەردەسەریت کردون.

ئەوە چ پیاوەتیەکە ئەگەر منداڵێکیان لـێ بەخێو بکەی؟!

کە بەخێویشت کردوە نەتزانیوە و هەڵەت کردوە ئەگەرنا ئەویشت دەکوشت!

پێتوایە چاکەت لەگەڵدا کردوم کە چەند ساڵێك منت بەخێو کـردوە، کەچـی هەمو نەوەی ئیسرائیلت کردۆتە کۆیلە؟!

---

(١) لێم خۆش بوە: لێی بوریوم.

## ٢١- بانگکردن بەرەو لای خوا

فیرعەون دەمکوت بو و نەیتوانی وەڵام بداتەوە، ویستی خۆی لە پرسیارەکە هەڵبوێرێ، بۆیە گوتی:

پەروەردگاری بونەوەر کێیە؟ کە گوێم لێتە ناوی دەبەی؟

موسا گوتی: پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەمین و نێوانیانە ئەگەر بڕواداری دڵنیان.

فیرعەون لەم وەڵامە تورە بو، ویستی تورەیی ئامادەبوانی نێو کۆڕەکەش بورووژێنێ و سەریان لە وتەکانی موسا بسوڕمێنێ.

بۆیە ڕوی کردە ئامادەبوان و گوتی: گوێتان لێ نیە موسا چ دەڵێ؟!

بەڵام موسا قسەکانی خۆی نەبڕی و زەبری دوەمی ڕاوەشاندە فیرعەون و گوتی:

پەروەردگاری ئێوە و پەروەردگاری باب و باپیرانی پێشوتانە.

فیرعەون تورەتر بو و ئارامی نەگرت و گوتی:

دڵنیابن پێغەمبەرەکەتان شێت بوە.

بەڵام موسا قسەکانی خۆی نەپچڕاند و زەبری سێیەمی ڕاوەشاندە فیرعەون و گوتی:

پەروەردگاری ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات و نێوانیانە، ئەگەر ئێوە تێبگەن.

فیرعەون ویستی موسا لەم بابەتە تاڵە هەڵبوێرێ.

فیرعەون ویستی تورەیی دەست و پێوەندەکەی بورووژێنێ.

بۆیە گوتی: لەبارەی باب و باپیرانمان چ دەڵێی؟!

فیرعەون لە دڵی خۆی گوتی:

ئەگەر موسا بڵێ لەسەر هەق بون، دەڵێم: ئەوان بتیان دەپەرست!

ئەگەر بشڵێ: لە گومڕاهی و لە گەمژەیی دابون، ئەوا ئامادەبوانی کۆڕەکە تورە دەبن و دەڵێن: موسا جوێن بە باب و باپیرانمان دەدا.

بەڵام موسا لە فیرعەون زیرەکتر بو، موسا خوا ڕێی ڕاستی بۆ ڕۆشن دەکاتەوە، گوتی:

باب و باپیرانی پێشو چیان کردبێ و چۆن بوبن لەلای پەروەردگار بزر نیە و گشتی نوسراوە، پەروەردگاری من شت لەبیر ناکا و بە هەڵەدا ناچێ.

پاشان موسا قسەی بردەوە سەر ئەو بابەتەی کە فیرعەون دەیویست خۆی لێ ڕزگار بکات.

موسا گوتی:

پەروەردگاری من شت لەبیر ناکات و بەهەڵەدا ناچێ.

ئەو پەروەردگارەی کە زەوی بۆ ژیان سازاندوە و گەلێك ڕێگە و ڕەوازیشی[1] لەسەر زەوی بۆ داناوین.

ئەو پەروەردگارەی کە بارانی لە ئاسماندا باراندوە.

لێرەدا فیرعەون دەمکوت دەبێ و قسەی دەبڕێ، بۆیە وەك هەمو پاشایەکی زۆردار پەنا دەباتە بەر زەبروزەنگ و تورەیی و دەڵێ:

باپێت بڵێم ئەگەر هەر یەکێکیتر جگە لە من بە خواوەند بزانی دەتخەمە بەندیخانە و بەندت دەکەم.

---

(١) ڕەواز: ڕێگایەك هاتوچۆی لەسەر بێ.

## ٢٢- موعجیزەکانی موسا

فیرعەون کە تیرەکانی خۆی هاوێشت موسا ویستی تیری خوای تێبگرێ.

موسا گوتی: ئەدی ئەگەر بەڵگەی پێغەمبەرایەتیم پێنیشان دای بڕوام پێدێنی؟

فیرعەون گوتی: بیهێنە ئەگەر ڕاست دەکەی.

موسا گۆچانەکەی هەڵدا و یەکسەر بوە مارێکی زل و زەبەللاح.

پاشان دەستی بردە بن باخەڵی و دەریهێنا یەکسەر دەستی زۆر سپی بو.

فیرعەون مەهانەیەکی[١] دۆزیەوە و بە ئامادەبوانی گوت:

جادوگەرێکی[٢] زانایە.

ئامادەبوان گوتیان: ڕاست دەکەی جادوگەرە، جادوەکەی ڕون و ئاشکرایە.

موسا گوتی: ئێوە بە شتی ڕاستەقینە دەڵێن جادو، ئەوەی جادوگەر بێ جادوەکەی تاسەر نیە و سەرناکەوێ.

فیرعەون گوتی: ئێوە دەتانەوێ لە ڕێبازی باب و باپیرانمان وەرچەرخێنن[٣]، دەسەڵات و پاشایەتی بۆ خۆتان وەدەست بێنن. ئێمە بڕواتان پێ ناهێنین.

فیرعەون وەکو پاشا زۆردارەکان ویستی دەست و پێوەندەکەی لە موسا بترسێنێ و گوتی:

---

(١) جادوگەر: سیحرباز　　　جادو: سیحر

(٢) وەرچەرخێنن: وەرسوڕێنن، لابدەن.

(٣) وەرچەرخێنن: وەرسوڕێنن، لابدەن.

موسا دەیەوێ بەهۆی جادوەکانیەوە لە وڵاتتان دەربەدەر بکا، ئێوە تەگبیرتان چیە؟

دەست و پێوەندەکەی گوتیان: پێمان باشە جادوگەرانی سەرتاپای وڵات کۆبکرێنەوە و موسای پێ ببەزێنین.

بەمجۆرە لە سەرتاپای وڵات بانگیان ڕاهێشت و گوتیان:

بۆ ئاگاداری، بۆ ئاگاداری... کێ جادوگەرە و جادو دەزانێ با لەلای پاشا ئامادە بێ.

جادوگەران لە هەمو لایەکەوە هاتن و لەلای پاشا کۆبونەوە.

بڕیار درا لە ڕۆژی جەژندا جادوگەرەکان ڕوبەروی موسا ببنەوە.

بانگی خەڵکیشیان کرد کۆببنەوە تا بەڵکو ببینن چۆن بەسەر موسا زاڵ دەبن.

## ٢٢- بەرەو گۆڕەپان

خەڵك لە بەیانیەکەی ڕۆژی جەژن زو لەماڵەوە دەرچون و پۆل پۆل بەرەو گۆڕەپانێ ڕۆیشتن.

منداڵ و گەنج و پیر و پیاو و ئافرەتان لە ماڵەوە دەرچون و بەرەو گۆڕەپان بەڕێکەوتن.

کەس لە ماڵەوە نەما تەنها نەخۆش و پەککەوتەکان نەبن.

لە کوچە و کۆڵان و بازاڕ و شاردا باس باسی جادوگەری و جادوگەران بو.

- ئەرێ جادوگەرە گەورەکەی شاری ئەسوان هات؟

- بەڵێ، جادوگەرە بەناوبانگەکەی شاری ئوقسور و شاری جیزەی بەناوبانگیش هاتن.

- ئەریٚ تۆ پێت وایە کێ دەباتەوە؟

هەرچی جادوگەری کارامە و گەورەی میسرە گشتیان کۆبونەوە، دەبێ کەس لێیان بباتەوە!

موسا و براکەی چۆن دەتوانن ببەنەوە؟!

موسا تا گەورە بو هەر لە کۆشکی پاشادا بو، پاشان بە ترس و لەرزەوە میسری بەجێهێشت و چوە مەدیەن، چەندساڵێکیش لە مەدیەندا مایەوە.

لە کوێ فێری جادو بوە؟

لە میسر؟ نەخێر.

لە مەدیەن؟ نەخێر، گوێمان لێنەبوە لەوێدا هونەر هەبێ!..

نەوەی ئیسرائیلیش هاتن و لەگەڵ خەڵك کۆبونەوە، دڵیان لەنێوان هیوا و بێهومێدیدا بو، ڕەنگە زیاتر بێهومێدیان بەسەردا زاڵ بوبێ، بەڵام خوا میهرەبانی لەگەڵ کوڕی عیمران دەکا! خوا نەوەی ئیسرائیل سەردەخا!

جادوگەرەکان بە لاف و گەزاف و لوتبەرزیەوە هاتنە ناو گۆڕەپان.

جل و بەرگی ڕەنگاوڕەنگیان لەبەرکردبو.

هەمو گۆچان و گوریسیان پێبو.

هەمو بە پێکەنین و گاڵتەجاڕیەوە بەرەو گۆڕەپانەکە دەهاتن.

دەیانگوت ئەمڕۆ ڕۆژی هونەرە!

ئەمڕۆ پاشا دەبینێ چ کارێکی عەنتیکە دەنوێنین.

ئەمڕۆ خەڵك دەبینێ چەند گرنگین!

کاتێك کە جادوگەرەکان ئامادەبون بە فیرعەونیان گوت:

ئەگەر سەرکەوین خەلاتمان دەکەی؟

فیرعەون گوتی: بەڵێ پلە و پایەشتان بەرز دەکەمەوە...

ئەمەیە خەلاتی پاشایان! ئەمەیە ڕێزانەی[1] پاشایان!

ئەمەیە کە پیاوی پێ دەخەڵەتێ!

ئەمەیە کە پشتی پاڵەوانان لە ئەرزی دەدا!

بەمجۆرە جادوگەرەکان بە بەڵێنەکانی فیرعەون دڵخۆش بون.

## ٢٤- لە نێوان ڕاست و ناڕاستدا

موسا بە جادوگەرانی گوت: چتان هەیە هەڵیدەن.

جادوگەرەکان گوریس و گۆچانەکانیان هەڵدا و گوتیان:

سوێند بە شان و شکۆی فیرعەون ئێمە سەردەکەوین.

خەڵك شتێکی سەیریان بینی، بە دەیان و سەدان ماریان دەدی لە گۆڕەپانـدا دەجمین، خەڵك کە ئەم دیمەنەیان بینی حەپەسان و بۆ پاشەوە کشانەوە.

هاواریان کرد: مار! مار!

ئافرەتـەکان قیژانـدیان، منداڵـەکان زیڕانـدیان، هـەراوهۆریا گۆڕەپـانی هەژاندەوە.

---

(١) ڕێزانە: ڕێز لێنان.

ئەوەی خەڵك دیتی موساش دیتی و سەری سوڕما، موسا گوریس و گۆچانەکانی لەبەرچاودا ببوە مار و دەجولان.

موسا ترسێکی بە دڵدا هات!

چۆن نەترسێ؟ ئەمڕۆ ڕۆژی تاقیکردنەوەیە، پیاویش لە تاقیکردنەوەدا یان دەباتەوە یان دەدۆڕێ!

ئەگەر خوانەخواستە جادوگەرەکان ببەنەوە.

ئەگەر خوانەخواستە موسا بدۆڕێنێ.

چ ڕو دەدا؟ پەنا بەخوا!!

سەرکەوتنی موسا سەرکەوتنی پیاوێك نیە.

بەڵکو سەرکەوتنی ئاینە بەسەر پاشا.

سەرکەوتنی ڕاستیە بەسەر ناڕاستی.

خوایە موسا نەدۆڕێنێ! خوایە موسا ژێر نەکەوێ!

موسا ترسی بە دڵدا هات بەڵام خوا ورەی[1] موسای بەرز کردەوە و پێی فەرمو:

مەترسە تۆ سەرکەوتوی.

تۆ گۆچانەکەی دەستی ڕاستت هەڵدە ئیتر هەرچی فڕوفێڵی جادوگەران هەیە قوتی دەدا، جادوگەران سەرناکەون.

موسا بە جادوگەرانی گوت:

---

(١) ورە: عەزیمەت.

کارەکەی ئێوە جادوە، خوا جادوان پوچەڵ دەکاتەوە.

خوا کاری بەدکاران ناسازێنێ.

خوا وتەی ڕاستی خۆی سەردەخا ئەگەرچی تاوانکارانیش پێیان ناخۆش بێ.

موسا گۆچانەکەی هەڵدایە ناو گۆڕەپان و بو بە مارێکی زل و زەبەللاح، هەمو گوریس و گۆچانەکانی جادوگەرانی هەڵلوشی.

بەمجۆرە ڕاستی سەرکەوت و ناڕاستی پوکایەوە.

جادوگەرەکان تاسان و واقیان وڕما...

- ئەمە چیە؟

ئێمە دەزانین جادو چۆنە و چۆن نیە.

ئێمە دەزانین جادو چەند جۆری هەیە.

ئێمە مامۆستای هونەرین!

ئێمە پێشەوای هونەرین!

ئەمە جادو نیە! ئەمە جادو نیە!

چونکە ئەگەر ئەمە جادو بوایە بە جادو دەمانبەزاند.

ئەگەر هونەر بوایە بە هونەر دەمانشکاند!

بەڵام هونەرەکانی ئێمە لەبەردەم ئەم کارەدا پوکایەوە، وەك خوناوی بەر هەتاوێ بو بەهەڵم و توایەوە!

ئەم کارەی لە کوێ هێناوە؟ دیارە لەلای خواوەیە!

جادوگەرەکان دڵنیا بون کە موسا پێغەمبەرە و خوا ئەم موعجیزەیەی داوەتێ، جادوگەرەکان هەمو بە یەك دەنگ هاواریان کرد:

بڕوامان بە پەروەردگاری موسا و هارون هێنا.

هەمو سوژدەیان بۆ خوا برد و گوتیان:

بڕوامان بە پەروەردگاری بونەوەر هێنا، کە پەروەردگاری موسا و هارونە.

## ٢٥- هەڕەشەکانی فیرعەون

فیرعەون شێت و هار بو.

ئۆقرەی لێ بڕا، ئاگری لە چاوان دەباری، هەورەتریشقەی لە نێوچەوانی هەڵدەستا!

هەی داماو فیرعەون! ئەوەی لێی دەترسا و نەیدەویست ڕو بدا ڕوی دا!

دەیویست بە جادوگەران موسا ببەزێنێ کەچی جادوگەرەکان لێی هەڵگەڕانەوە و بونە سەربازی موسا!

دەیویست بە جادوگەران خەڵك لە موسا بکاتەوە، کەچی جادوگەرەکان خۆیان بەر لە هەمو کەس بڕوایان پێهێنا!

فیرعەون تیرێکی بەرزی هاوێشت بەڵام بەخۆی کەوتەوە.

فیرعەون وایدەزانی وەك چۆن دەسەڵاتی بەسەر لاشەدا هەیە دەسەڵاتی بەسەر هزریشدا[1] هەیە.

---

(١) هزر: بیر، فکر.

وایدەزانی وەك چۆن دەسەڵاتی بەسەر زماندا هەیە دەسەڵاتی بەسەر دڵیشدا هەیە.

وایدەزانی ئەگەر بە ڕەزامەندی خۆی نەبێ نابێ هیچ کەسێك لە خەڵکی میسر بڕوا بە هیچ شتێك بێنن.

بۆیە بە لوتبەرزی و بە کەشوفشەوە[1] گوتی:

- چۆن بەر لەوەی من ڕێگاتان پێبدەم بڕوا بە موسا دێنن؟!

فیرعەون تیرێکی پاشایانەی تێگرتن و گوتی:

دیارە موسا مامۆستاتانە و ئەو فێری جادوی کردون!

پاشان تیری دوەمی تێگرتن و گوتی:

ئێوە پلانتان داناوەتەوە تا خەڵکی وڵات ئاوارە بکەن و خۆتان دەسەڵات بگرنە دەست، خۆم دەزانم چتان بەسەردێنم.

پاشان تیری ژەهراوی سێیەمی تێگرتن، کە دواهەمین تیری ناو تیردانی پاشایانە، گوتی:

شەرت بێ دەبێ دەست و پێی هەموتان ڕاست و چەپ ببڕم و لە خاچتان هەڵواسم.

بڕوادارەکان تیرەکانیان بە قەڵغانی بڕوا و ئارامگری پەرچ دایەوە.

گوتیان: بێباکین[2] چت نەکردوە بیکە، مادەم بڕوامان هێنا بشکوژرێین زەرەر ناکەین چونکە بۆ لای خوا دەگەڕێینەوە.

---

(١) کەشوفش: لاف و تەنتەنە.

(٢) بێباکین: بێمنەتین

هیوا لە خوا دەخوازین لە گوناهەکانمان ببورێت و لێمان خۆش بێ، کە بەر لە گشت خەڵك بڕوامان هێنا.

هەروەها بە بڕوایەکی پتەو و بە ورەیەکی بەرزەوە گوتیان:

ئێمە بڕوامان بە خوا هێنا و هیوا لە خوا دەخوازین لە گوناهەکان و لەو جادوەی تۆ پێتکردین لێمان خۆش بێ، پاداشتی لای خوا هێژاتر و تاسەرترە[1].

هەرکەسێك بە بێبڕوایی و تاوانکاری بگەڕێتەوە لای خوا، خوا دەیخاتە ناو دۆزەخ و توشی ئەشکەنجەی دەکا.

هەرکەسێکیش بە بڕواداری و چاکەکاری بۆ لای خوا بگەڕێتەوە خوا بەهەشتی پێدەبەخشێ و پلەی بەرز دەکاتەوە.

## ٢٦- گەمژەیی فیرعەون

فیرعەون بە ڕوداوەکەی موسا تەنگەتاو و نیگەران بو، خەو نەدەچوە چاوانی.

خواردن و خواردنەوەی لێ تاڵ بو.

توڕەییەکەی فیرعەون دەست و پێوەندەکەشی وروژاند.

دەستوپێوەندەکەی گوتیان: پاشا! چۆن لێدەگەڕێی موسا و نەتەوەکەی خراپەکاری لەسەر زەوی بڵاو بکەنەوە و واز لە تۆ و لە خواوەندەکانت بێنن؟!

فیرعەون زۆر توڕە بو و گوتی:

کوڕەکانیان دەکوژین و ئافرەتەکانشیان دەهێڵینەوە تا خزمەتمان بکەن، ئێمە بەهێزترین و بەسەریاندا زاڵ دەبین.

---

(١) تا سەر ترە: هەمیشە ترە.

فیرعەون پەنای وەبەر گشت فرۆفێڵێك دەبرد تا نەوەی ئیسرائیل و خەڵکی میسر لە موسا بڕەنجێنێ.

فیرعەون بە نەتەوەکەی خۆی گوت: نەتەوەکەم! خۆتان دەبینن چەند بە دەسەڵاتم، میسر موڵکی خۆمە، ڕوبارەکانی میسر کە کشتوکاڵی لەبەر دەکەن و پێی دەژین موڵکی منە.

پێم بڵێن من باشترم یان موسای بێهێز و بێدەسەڵات؟!

پاشان بە سەنگینی و ئەسپاییەوە[1] گوتی:

چاوساغانی نەتەوەکەم! نەمزانیوە جگە لە خۆم هیچ خواوەندێکی ترتان هەبێ.

وەك بڵێی زۆر سۆراخی خواوەندێکی کردبێ و زۆری بیرکردبێتەوە و ئامۆژگاری گەلەکەی بکات!

پاشان وەك گەمژە و شێتان گوتی: هامان! لە قوڕ خشتان ببڕن و لەسەر ئاگر داغی[2] بکەن و بیکەن بە کەرپوچ، لەم کەرپوچانەوە باڵاخانەیەکی بڵندم بۆ هەڵبنێن، بەڵکو دەگەمە لای خواوەندەکەی موسا و دەیبینم، هەرچەندە پێم وایە موسا درۆ دەکات.

هامان خشتێکی گەلێ زۆری بە خەڵك بڕی.

لەسەر ئاگر داغیان دەکرد و دەبونە کەرپوچ.

پاشان دەستیان پێکرد باڵاخانەکە دروست بکەن.

ماوەیەکی دورو درێژ خەریکی بون و گەلێکیان بڵند هەڵنا.

---

(١) ئەسپایی: لەسەرخۆیی.

(٢) داغ کردن: سۆرکردنەوە.

هامان و وەستاکان زۆر شەکەت وماندو بون، قورِ لەبەر برِا، کەرپوچ نەمان.

کەچی فیرعەون هێشتا گەلێکی ماوە، باڵاخانەکە هێشتا نزیکی هەور نەبۆتەوە چ جای ئەوەی بگاتە مانگ!

هێشتا نزیکی مانگ نەبۆتەوە چجای ئەوەی بگاتە خۆر!

هێشتا نزیکی نزیکی خۆر نەبۆتەوە چجای ئەوەی بگاتە هەسارەکان!

هێشتا نزیکی هەسارەکان نەبۆتەوە چجای ئەوەی بگاتە ئاسمان!

فیرعەون دڵساردو شەرمەزار بو، فیرعەون هیوای برِا و دەستەوئەژنۆ لە شوێنی خۆی دانیشت و لە روِ داما.

فیرعەون چەند داماوە! دیارە نازانێ خوا چەند بەرز و گەورەیە؟

دیارە نازانێ خوا ئەرز و ئاسمانە بەرزەکانی ئەفراندوە؟ دیارە نازانێ هەرچی شتێکی لە ئەرز و ئاسمانەکاندا هەیە هی خوایە؟

دیارە نازانێ خوای گەورە خوای ئەرز و ئاسمانە؟!

فیرعەون دوای کردوکۆشە بێئاکام و تێکشکاوەکانی هیچ فرِوفێڵێکی تری پێ نەما تەنها ئەوە نەبێ کە برِیارێ بدا موسا بکوژێ، بەو بیانوەی گوایا خراپەکاری لەسەر زەوی بڵاو دەکاتەوە!

فیرعەون گوتی: لێم گەرِێن با موسا بکوژم، کە کوشتم ئەوجا با هاواری خواکەی بکات!

بۆیە دەیکوژم نەوەك رِێبازەکەتان بگۆرِێ یان خراپەکاری لەسەر زەوی بڵاو بکاتەوە.

## ٢٧- بڕوادارەکەی خزمی فیرعەون

فیرعەون کاتێك ویستی موسا بکوژێ، پیاوێکی بڕواداری خزمی فیرعەون کە بە نهێنی بڕوای هێنابو هەڵسایەوە و گوتی:

دەتانەوێ پیاوێك بکوژن کە دەڵێ خوا پەروەردگارمە و لە پەروەردگاری خۆشیڕا چەند نیشانەی زۆر ئاشکرای بۆ هاوردون؟!

بڕوادارە ئازا و زیرەکەکەی خزمی فیرعەون گوتی:

لەبەرچی بەرەنگاری[1] موسا دەبنەوە و ئازاری پێدەگەیەنن؟

ئەگەر بڕواشی پێ ناهێنن وازی لێ بێنن خۆی و ڕێبازەکەی خۆی.

ئەگەر درۆزن بێ ئەوا تاوانی درۆیەکەی لە ملی خۆیەتی و پەیوەندی بە ئێوە نیە.

ئەگەر ڕاستیش بکا و پێغەمبەر بێ ئێوەش ئازاری بدەن ئەوا قوڕتان بەسەری... هەندێك لەو هەڕەشانەی ئەو پێتان دەڵێ دێنەدی و هەموتان تەفروتونا[2] دەبن.

براکانم! بە موڵکی زۆر و زەوەند لە خۆبایی مەبن، بە هێز و لەشکری گەورە لە خۆ دەرمەچون.

نەتەوەکەم! ئەمڕۆ ئێوە باڵادەستن، ئێوە دەسەڵاتتان بە دەستە، باشە ئەگەر سزای خوا توشمان ببێ کێ هەیە ڕزگارمان بکا؟!

فیرعەون لە وەڵامدا گوتی:

---

(١) بەرەنگاربونەوە: ڕوبەڕوبونەوە.

(٢) تەفروتونابون: لەناچون و کاولبون.

من هەر سورم لەسەر کوشتنی موسا و ئەوەی منیش پێتان دەڵێم هەر ئەو ڕاستە.

بڕوادارە ئازا و زیرەکەکە ویستی نەتەوەکەی لە سەرەنجامی پڕ ئازار و چارەنوسی ستەمکاران بترسێنێ و گوتی:

نەتەوەکەم! من لەوە دەترسم توشی سزایەکی وەك سزای نەتەوەی نوح و عاد و پەهمود و بێبڕواکانی تر ببن، دیارە ئەوان تاوانیان کردوە بۆیە توشی سزا بون ئەگەر نا خوا ستەم لە بەندەکانی خۆی ناکا.

بڕوادارە ئازا و زیرەکەکە نەتەوەکەی بە ڕۆژی دوایی ترساند.

دەزانی ڕۆژی دوایی چیە؟

ڕۆژی دوایی ئەوەندە سەخت و ناخۆش و پڕ ئازارە پیاو ئاوڕ لە برا و دایك و باوك و ژن و منداڵەکانیشی ناداتەوە، چونکە لەم ڕۆژەدا هەمو کەسێك پەرێشانە و لەبەر پەشێویی خۆی ئاگای لە هیچ کەسێ نامێنێ.

لەم ڕۆژەدا تەنها بڕوادارەکان نەبێ ئەگینا هەمو برادەرەکانیتر لەگەڵ یەکتر دوژمن و لە یەکتر بێزارن.

لەم ڕۆژەدا خزمایەتی نامێنێ و کەس لە حاڵی کەس ناپرسێ.

لەم ڕۆژەدا خوای مەزن و باڵادەست بانگ دەکا:

ئەمڕۆ دەسەڵات بۆ کێیە؟.. هەڵبەت بۆ خوای زاڵ و تەنیایە.

لەم ڕۆژەدا خەڵك هەمو دەپەشۆکێن، هانا وەبەر یەکتر دەبەن، هاواری یەکتر دەکەن فریامان کەون فریا!

بەڵام کەس فریای کەس ناکەوێ و ئاوڕ لە یەکتر نادەنەوە، چونکە هەمو لەخۆ بێزارن و کەسیش هیچی پێناکرێ.

بڕوادارە ئازا و زیرەکەکە گوتی:

نەتەوەکەم! من دەترسم لەم ڕۆژەدا لێتان بقەومێ کە دەبێتە هاوارهاوار کە ڕۆژی قیامەتە، ئەوێ ڕۆژێ هیچ کەس هیچی بەدەست نیە و کەس فریاتان ناکەوێ، ئەگەر ئێوە گومڕا بن خوا یارمەتیتان نادا.

بڕوادارە ئازا و زیرەکەکە گوتی:

خوا چاکەیەکی گەلێك گەورەی لەگەڵدا کردن بەڵام ئێوە ڕێزتان نەزانی، جا کە ماڵئاوایی لێکردن ئەوسا ئەفسوستان[1] کێشا.

ئەم چاکەیە یوسفی پێغەمبەر بو - سڵاوی خوای لێبێ - کە ئێوە نەتانناسی و ڕێزتان نەزانی.

جا کە یوسف کۆچی دوایی کرد گوتتان:

پاکی و بێگەردی بۆخوا! پێغەمبەر نەبوە وەك یوسف بێ!

پادشا نەبوە وەك یوسف بێ!

پیاو نەبوە وەك یوسف بێ!

لە دوای یوسف لە کوێ پێغەمبەرێکی وەك یوسفمان بۆ دێ؟!

نەخێر قەت پێغەمبەرێکی وەك یوسفمان بۆ نابێتەوە!

بڕوادارە ئازا و زیرەکەکە گوتی:

---

(١) ئەفسوس: ئەسەف.

کاتی خۆی کە یوسف هات و بەڵگەی ڕون و ئاشکراشی پێبو بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتیەکەی، کەچی ئێوە گومانتان لێ هەبو، بەڵام وەختێ کە مرد گوتتان ئیتر پاش ئەو خوا هیچ پێغەمبەرێك نانێرێت.

بزانن ئەگەر ئەم پێغەمبەرەش بمرێ هەمان شت دەڵێن و پەشیمان دەبنەوە!

## ٢٨- ئامۆژگاری پیاوە بڕوادارەکە

بڕوادارەکە ئامۆژگاری نەتەوەکەی کرد و دڵسۆزی و خۆشەویستی خۆی بۆ دەربڕین و گوتی:

نەتەوەکەم! وەرن شوێنم کەون ڕێی ڕاستتان نیشان دەدەم.

بڕوادارە ئازا و زیرەکەکە دەیزانی نەتەوەکەی بە ژیانی دنیاوە مەستن.

دەیزانی فیرعەون بە موڵك و هێزە زۆرەکەی فریوی خواردوە[1] و لەخۆبایی بوە.

بەڵام ژیانی دنیا وەك خەونێکە و کۆتایی دێ، ژیانی دنیا وەك سێبەرێکە پاشان نامێنێ.

بڕوادارەکە زانی نەتەوەکەی بە خۆشی ژیانی دونیاوە سەرمەست بونە، سەرمەستیش گوێ بۆ وتەی ڕاست ناگرێ و هەست بە شتی چاك ناکا.

بۆیە ئەوانیش گوێ لە وتەکانی موسا ڕاناگرن.

بڕوادارەکە ویستی لەم بێئاگابونە بێداریان بکاتەوە و پێی گوتن:

---

(١) فریو خواردن: خەڵەتان.

نەتەوەکەم! بە ژیانی دنیا مەخەڵەتێن، ژیانی دنیا چەند خۆشیەکی سنوردارە و دەبڕێتەوە، ژیانی دوارۆژ هەمیشەییە و نابڕێتەوە.

لێرەدا نەفامانی نەتەوەکەی بەم قسانە هەڵچون، بانگی بڕوادارەکەیان دەکرد بێتەوە سەر ڕێی بێبڕوایی و هاوبەشپەرستی، بانگیان دەکرد بگەڕێتەوە سەر ئاینی باب و باپیران.

بڕوادارەکە دەیگوت: بۆ لای خوا بگەڕێنەوە و خوا بپەرستن.

ئەوانیش دەیانگوت بۆ سەر ئاینی باب و باپیران بگەڕێوە!

زۆریان لەگەڵ هەوڵدا و سنوریان بەزاند ئەویش پێی گوتن:

نەتەوەکەم! ئەوە چیتان لێقەوماوە!

من بۆ ڕزگاری بانگتان دەکەم کەچی ئێوە بۆ دۆزەخ بانگم دەکەن؟!

من بۆ لای خوای باڵادەست و لێبوردە بانگتان دەکەم، کەچی ئێوە بانگم دەکەن، تا بەخوا بێبڕوا بم و هاوبەشی بۆ بڕیاردەم.

بڕوادارە ئازا و زیرەکەکە پێی گوتن:

خواوەندەکانی ئێوە کام پێغەمبەریان ناردوە؟

کام پەڕتوکیان دابەزاندوە؟

کێ بانگەوازی بۆ کردون؟

خواوەندەکانی ئێوە ڕاستەقینە نین، بەڵکو تەنها چەند ناوێکن کە خۆتان و باب و باپیرانتان هەر لە خۆڕا و بەبێ بەڵگە هەڵتانبەستون.

بەڵام ئەوەتانێ پێغەمبەرانی خوا هەمویان بانگەوازیان بۆ لای خوا کردوە، ئەوە ئیبراهیم، یوسف و، ئەو پێغەمبەرەی خواش کە موسایە.

سەیرکەن هەمو شتێك نیشانەی بونی ئەم خوایەیە!

لە هەمو شوێنێك پێغەمبەر هەیە و بانگی خەڵکی کردوە!

بەڵام ئێوە کە بانگی من دەکەن تا بۆ لای ئەم خواوەندانە بگەڕێمەوە هەڵبەت نە لە دنیا و نە لە دوایش ناتوانن بە هانای کەس بچن.

بڕوادارەکە لە گێل و وێلیان بێزار بو، بۆیە بەجێی هێشتن و، پێی گوتن:

ڕۆژێك دادێ وتەکانی منتان بە بیر بێتەوە، من خۆم بە خوا سپاردوە، خوا بەندەکانی خۆی دەبینێ و ئاگاداریانە.

خەڵکەکە توڕە بون و خزمەکانی فیرعەون ویستیان بیکوژن، بەڵام خوا پاراستی و دوژمنانیشی لەناو برد.

## ٢٩- ژنی فیرعەون

فیرعەون وایدەزانی وەك چۆن دەسەڵاتی بەسەر لاشەدا هەیە دەسەڵاتی بەسەر هزریشدا هەیە.

وایدەزانی وەك چۆن دەسەڵاتی بەسەر زماندا هەیە دەسەڵاتی بەسەر دڵیشدا هەیە.

وایدەزانی ئەگەر بە ڕەزامەندی خۆی نەبێ نابێ هیچ کەسێ لە خەڵکی میسر بڕوا بە هیچ شتێ بێنێ.

ئەگەر فیرعەون بیزانیبایە یەکێك وا لەوسەری وڵاتی میسرەوە بڕوای بە موسا هێناوە شێت و هار دەبو، حەجمانی نەدەما، ئاگری لە چاوان دەباری، هەورەتریشقەی لە نێوچەوان هەڵدەستا، دەیگوت:

چۆن دەبێ بڕوا بە موسا بێنێ بەر لەوەی ڕێگەی بدەم؟!

لە وڵاتی من بژی و سەرپێچی بکا؟!

بژێوی من بخوا و بڕوام پێنەهێنێ؟!

دەبێ منیان پێ لە خۆشیان لە پێشتر بێ!

فیرعەون لەبیری نەمابو بەخۆی وا لەسەر ئەرزی خوا دەژی و سەرپێچی لە فەرمانەکانی خوا دەکات، وا بژێوی خوا دەخوا و بڕوا بە خوا ناهێنێ!

خوای گەورە لە ناو ماڵی فیرعەوندا نیشانەیەکی بە فیرعەون نیشان دا.

لەناو خێزانی فیرعەوندا نیشانەیەکی بە فیرعەون نیشان دا.

بۆی ڕون کردەوە کە خوا دەسەڵاتی بەسەر هزردا هەیە وەك چۆن دەسەڵاتی بەسەر لاشەدا هەیە.

خوا دەسەڵاتی بەسەر دڵدا هەیە وەك چۆن دەسەڵاتی بەسەر زماندا هەیە.

خوا دەبێتە لەمپەر لە نێوان مێرد و ژنەکەی.

خوا دەبێتە لەمپەر لە نێوان مرۆڤ و دڵی.

بڕوا چوە ناو ماڵەکەی فیرعەون بێئەوەی فیرعەون هەستی پێبکات، بێئەوەی فیرعەون هیچی پێبکرێ.

ژنەکەی فیرعەون بڕوای بە خوا هێنا و بە فیرعەون بێبڕوا بو.

بڕوای بە موسا هێنا ئەگەرچی مێردەکەی پاشای میسر بو.

شارەزاترین کەس بە فیرعەون و خۆشەویسترین کەس لە لای فیرعەون بڕوای بە موسا هێنا.

ژنی فیرعەون بڕوای هێنا بێئەوەی جەندرمەکانی فیرعەون بتوانن هیچ بکەن، بێئەوەی هەستی پێبکەن، هەرچەندە وەك مێرولان بۆنیان دەکرد و وەك قەلەڕەشان دەیانڕوانی.

فیرعەونیش هەستی پێنەکرد، هەرچەندە نزیکترین کەسیشی بو.

جا ئەگەر فیرعەون بیزانیبایە چی دەکرد؟

فیرعەون دەسەڵاتی بەسەر لاشەدا هەیە بەڵام دەسەڵاتی بەسەر هزردا نیە.

فیرعەون دەسەڵاتی بەسەر زماندا هەیە بەڵام دەسەڵاتی بەسەر دڵدا نیە.

ژن دەبێ گوێڕایەڵی مێردی بێ، بەڵام نەك لە بێبڕوایی و لە گوناحان، چونکە ئەگەر یەکێك لە لایەن هەرکەسێکەوە فەرمانێکی دژ بە فەرمانی خوای پێبکرێ نابێ گوێڕایەڵ بێ.

منداڵیش دەبێ گوێڕایەڵی دایك و باوکی بێ و چاکەیان لەگەڵ بکا، بەڵام ئەگەر فەرمانێکیان پێکرد بێبڕوایی بو یان گوناح بو نابێ جێبەجێی بکا چونکە خوا ڕازی نابێ.

﴿ وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَىٰ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ . واتە: ئەگەر دایك و باوك هانیان دای شتێك بکەی بە هاوبەشم کە خۆت هیچی لێ نازانی، فەرمانیان بەجێ مەهێنە؛ لە دنیادا بەخۆشی لەگەڵیان بژی و، هەر لە شوێن ئەوانە بڕۆ کە بەرەو خوا

گەڕاونەوە، لە ئاکامدا هەر دەگەڕێنەوە لای من، ئەوسا تێتان دەگەیەنم چیتان کردوە﴾. [١]

ژنەکەی فیرعەون لەسەر بڕواکەی خۆی مایەوە و نەچوەوە سەر بێبڕوایی، لە ژوری خۆی لەماڵی دوژمنی خوا بە نهێنی خوای خۆی دەپەرست.

لە خوا دەترسا و خۆی لە ستەمکاریەکانی فیرعەون بێبەری دەکرد.

خوای گەورە لە ژنەکەی فیرعەون خۆش بو و لە فیرعەون و زوڵمەکانی رزگاری کرد، خوای گەورە لە قورئاندا بەسەرهاتی ژنەکەی فیرعەون بەنمونەی بڕواداری و ئازایەتی بۆ بڕواداران دێنێتەوەو دەفەرموێ:﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ واتە: خوا ژنەکەی فیرعەون بەنمونە بۆ بڕواداران دێنێتەوە. کە لەبەر پەروەردگاری خۆی پاڕایەوە: پەروەردگارا! تۆ لەلای خۆت لە بەهەشتدا ماڵێکم بۆ دروست بکە و لە فیرعەون و کردەوەکەی رزگارم بکە و، لەناو کۆمەڵی ناهەقانیش رزگارم بکە﴾. [٢]

## ٣٠- نەهامەتیەکانی نەوەی ئیسرائیل

خەڵك کە زانییان فیرعەون دوژمنایەتی نەوەی ئیسرائیل دەکا؛ ئەوانیش دوژمنایەتیان دەکردن و ئەزیەتیان دەدان تا بەڵکو لە فیرعەون نزیك ببنەوە.

منداڵ و تواڵ گەمەیان بە نەوەی ئیسرائیل دەکرد و وەك سەگ پێیان دەوەڕین.

---

(1 ) لقمان ١٥

(٢) سورەتی التحریم(١١)

هەر ڕۆژەی نەهامەتیەکی نوێیان بەسەردا دەهات، هەر ڕۆژەی توشی بەڵایەك دەبون.

موسا ـ درود و سڵاوی خوای لێبێ ـ دڵی دەدانەوە و ئامۆژگاری دەکردن ئارام بگرن، پێی دەگوتن:

پشت بەخوا ببەستن، ئارام بگرن، زەوی هی خوایە، خوا بە ویستی خۆی بەندەکانی باڵادەست دەکا، سەرەنجامیش بۆ لەخواترسانە:

نەوەی ئیسرائیل لەم نەهامەتی[1] و ئێش و ئازارانەی توشیان دەهات بێزار بون، بە موسایان گوت:

ئەی موسا! تۆ هیچ سودێکت بە ئێمە نەگەیاند!

تۆ هیچ بەڵایەکت لەکۆڵ نەکردینەوە!

پێشئەوەی تۆ بێی ئازاریان دەداین دوای ئەوەی کە تۆش هاتی هەر ئازار دەدرێین.

بەڵام موسا ورەی دانەبەزی! بەڵام موسا بێهومێد نەبو! گوتی:

ئارام بگرن، خوا دوژمنەکەتان لەناو دەبات، پاشان ئێوە باڵا دەست دەکا تا دەرکەوێ ئێوە چ جۆرە کارێك دەکەن.

نەتەوەکەم! ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خوا هێناوە و ملکەچی فەرمانەکانی خوان پشت بەخوا ببەستن.

ئەوانیش گوتیان: خوایە پشت بە تۆ دەبەستین، خوایە نەمانخەیتە بن دەستی ئەم ستەمکارانە، خوایە لەم نەتەوە بێبڕوایە ڕزگارمان بکە.

---

(١) نەهامەتی: بەدبەختی.

فیرعەون نەیدەهێشت نەوەی ئیسرائیل خوا بپەرستن، ئەگەر بیدیبان خوا دەپەرستن و نوێژ دەکەن توڕە دەبو.

فیرعەون نەیدەهێشت مزگەوت لە وڵاتەکەیدا دروست بکەن، ئەگەر لە وڵاتەکەیدا خوا بپەرسترا بوایە توڕە دەبو.

فیرعەون چەند نەفامە! خۆ زەوی هی فیرعەون نیە هی خوایە!

کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە ناهێڵێ خوا لەسەر زەوی بپەرسترێ؟!

کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە لەسەر زەوی خوا دەڵێتە خەڵکی: من بپەرستن؟!

بەڵام فیرعەون ناتوانێ نەهێڵێ خەڵك لەناو ماڵی خۆی خوا بپەرستێ!

خوا لەسەر زاری موسا بە نەوەی ئیسرائیلی فەرمو:

ماڵەکانی خۆتان بکەن بە مزگەوت و لەوێ نوێژ بکەن.

فیرعەون و جەندرمەکانی نەیاتوانی نەوەی ئیسرائیل لە پەرستنی خوا دابڕێنن!

کێ دەتوانێ بەندە لە خوا دابڕێنێ؟!

کێ دەتوانێ موسڵمان لە پەرستنی خوا دور خاتەوە؟!

## ٣١- برسێتی

کاتێك فیرعەون لە سنوری تێپەڕاند و تەواو لەخوا یاخی بو، گەلێك بێئاگا و لامل[1] بو، خوا ویستی ئاگاداری بکاتەوە.

خوا ڕازی نابێ بەندەکانی بێبڕوا بن! خوا حەز ناکا خراپـەکاری لەسـەر زەوی بلاو بێتەوە!

فیرعەون پیـاوێکی زۆر کەللـە ڕەق بـو، دانـایی و ئامۆژگـاری دادی نـەدا. کەریش تا لێی نەدرێ ئاگادار نابێتەوە!

جا خوا ویستی فیرعەون ئاگادار بکاتەوە!

میسر ولاتێکی بە پیت و بەرەکەت و پـڕ لەشـینایی بـو، ولاتـی خێروبێـر و بەروبوم و دانەوێڵە بو.

لەسەردەمی یوسفدا - سلاوی خوای لێبێ- کە برسیەتی بلاوبـوەوە زانیتـان ولاتی میسر چۆن ولاتە دورەکانی ڕزگار کرد.

زانیتان میسر چۆن خەڵکی شام و خەڵکی کەنعانی لە برسیەتی رزگار کرد!

زەوی و زارەکانی میسر بە زێی نیل ئاو دەدران.

کشتوکاڵەکانی مسیر بە زێی نیل ئاودێر کرابون.

زێی نیل سەرچاوەی خێر و خۆشی میسر بو.

فیرعەون و خەڵکی میسر وایاندەزانی زێی نیل کلیلی رزق و ڕۆزییە.

وایاندەزانی ئەگەر میسر زێی نیلی هەبێ پێویستی بە باران و بەهیچ شتێکی تر نیە.

---

(١) لامل: سەرسەخت، ڕکەگر، عیناد.

نەیاندەزانی کلیلی ڕزق و ڕۆزی بەدەست خوایە.

نەیاندەزانی خوا ڕزق و ڕۆزی دەبەخشێ و هەڵیدەگرێ.

نەیاندەزانی زێی نیلیش هەر بە فەرمانی خوا دەڕوات و ئاوی زۆر دەبێ.

بە فەرمانی خوا نیل وشکی کرد و ئاوەکەی چۆوە ژێر زەوی.

خەڵکی میسر کەوتنە نەهامەتی و نەیاندەزانی زەوی و زارەکانیان بە چ ئاو بدەن؟!

بەروبوم و دانەوێڵە کەم بونەوە، برسێتی بڵاوبۆوە و گرانی بە دوای گرانی دادەهات!

فیرعەون و هامان و جەندرمەکان هەرچەندی کردیان و کۆشییان چارەیەکیان پێنەکرا.

لێرەدا خەڵکی میسر بۆیان ڕون بوەوە کە فیرعەون پەروەردگاریان نیە و ڕزق و ڕۆزی بەدەست خوایە نەك فیرعەون!

بەڵام فیرعەون بەم نەهامەتیە پەندی وەرنەگرت، خەڵکی میسر پەندیان وەرنەگرت و بێدار نەبونەوە!

شەیتان وای کرد سود لە پەندو ئامۆژگاری وەرنەگرن.

خەڵکی میسر گوتیان ئەم هەمو برسیەتی و قاتوقڕیە بەهۆی نەگبەتی موسا و نەتەوەکەیەتی!

قسەیەکی چەند سەیرە! ئەدی موسا پێشتریش لەناویاندا نەبو؟! ئەدی نەوەی ئیسرائیل ڕۆژگارێك نیە لەناویاندا دەژین؟!

نەخێر لەبەر نەگبەتی کردەوە خراپەکانی خۆیانە!! لەبەر نەگبەتی بێبڕوایی خۆیانە!!

فیرعەون و نەتەوەکەی سەرسەخت بون و گوتیان ئێمە مل بۆ ئەم جادوە کەچ ناکەین.

گوتیان: موسا! هەرچەندی نیشانەمان بۆ بێنی و جادومان لێبکەی هەر بڕوات پێ ناهێنین.

## ٣٢- پێنج نیشانە

خوای گەورە نیشانەیەکی تری بۆ ناردن.

بارانێکی زۆری بەسەردا باراندن، ئاوی نیل هەستا.

ئاسمان هەرباراندی هەر باراندی، تا هەمو کشتوکاڵ و زەوی و زارەکانیان نقوم بو، بەروبوم و دانەوێڵەکان خەسار بون.

باران بەڵایەکی گەورەی توش کردن.

تا دوێنێ سکاڵایان لە بێبارانی دەردەبڕی کەچی ئەمڕۆ سکاڵا لە زۆرباربن دەردەبڕن!

پاشان خوا کللۆی بۆ ناردن، کللۆ بە کشتوکاڵ و زەویوزاران وەربون و لە دار و درەختان وروکان، ڕویان لەهەر کوێ بکردبایە هیچیان بەسەر هیچەوە نەدەهێشت.

سەرباز و جەندرمەکانی فیرعەون نەیانتوانی لەگەڵ سەربازانی خوا بجەنگن.

چۆن دەتوانن لەگەڵیان بجەنگن؟ خۆ شمشێر و تیرو ڕم دەروەستیان[1] نایەن!

لێرەدا خەڵکی میسر بێدەسەلاتی فیرعەون و بێدەسەلاتی هامان و بێتوانایی جەندرمەکانیان بۆ ڕون بوەوە.

بەلام پەندیان وەرنەگرت و بێدار نەبونەوە!

بۆیە خوا جۆرە سەربازێکی تری بۆ ناردن، کە ئەوانیش ئەسپێ بون.

ئەسپێ داروبەردی لـێ تەنینەوە.

سەرجێگە هەر ئەسپێ بو، ناو جل و بەرگ هەر ئەسپێ بو، نـاو پرچـی سـەر هەر ئەسپێ بو، ناو موی جەستە هەر ئەسپێ بو.

خوا لە ئەسپێمان بپارێزێ!

لەبەر ئەسپێ خەویان نەبو، شەو تـا بـەیانی هـەر خـەریك بـون بـە نینـۆك ئەسپێیان دەكوشت.

چۆن دەتوانن لەگەڵ ئەسپێ بجەنگن؟ خۆ شمشێر و تیر و ڕم دەروەستیان نایەن! خۆ سەرباز و جەندرمەکانیش ناتوانن لە دەست ئەسپێیان ڕزگار بن!

پاشان خوا بۆقی بۆ ناردن، بۆق دنیای پڕ کرد، خـواردن هـەر پـڕی بـۆق بـو، خواردنەوە هەر پڕی بۆق بو، جل و بەرگ هەر پڕی بۆق بو.

لەبەر بۆق لە خۆیان بێزار ببون، ژینیان لـێ تاڵ ببو.

بۆق بە هەمو شوێنێنان بـلاو ببونـەوە، گـشت کـون و کەلەبـەرێکی خانویـان تەنیبوەوە.

---

(١) دەروەست: دەرەقەت.

بۆقێك لەملاوە دەیقیڕاند، بۆقێکیتر لەملاوەتر بێدەنگ دەبو، بۆقێکی تـر لەولاوە پازی دەدا...

هەر بۆقێکیان دەکوشت (دە) بۆقی تر دەهاتنە جێی، هەر بۆقێکیان دەردێنا پێنج بۆقیتر پەیدا دەبون، دەتگوت لە ماڵێدا زۆر دەبن.

پاسەوان و جەندرمـەکان هەرچـەندی کردییـان و کردییـان نـەیانتوانی بـۆق قەلاچۆ[1] بکەن.

ئەمجارە خوا نیشانەی پێنجەمی بۆ ناردن، نیشانەکەی ئەمجارە خوێن بو.

هەمو توشی خوێن پژانی لوت بون، خوێن لە لوتیان نەدەوەستا، زۆر بێهێـز و کەشەنگ ببون.

پزیشکەکان نەیانتوانی چارەسەرێ بدۆزنەوە و هیچ دەرمانێك دادی نەدان.

هەر جارێك کە خوا نیشانەیەکی بۆ دەناردن دەهاتنە لای موسا و دەیانگوت: تۆ لە خوا بپاڕێوە تا ئەم بەلایەمان لەسەر هەڵگرێ و ڕزگارمان بکات، ئێمـەش پەیمان دەدەین پەشـیمان دەبینـەوە و بـڕوا دێـنین و نـەوەی ئیـسرائیلت لەگـەڵ دەنێرین.

خـوا بەلایەکـەی لەسـەر هەڵـدەگرتن و ڕزگـاری دەکـردن، بـەلام ئـەوان پەیمانەکەیان دەشکاند.

خوا لە قورئان دەفەرموێ: ئێمە لافاو و کللۆ و ئەسپێ و بۆق و خوێنمـان بـۆ ناردن، کە چەند نیشانەیەکی ڕون و ئاشکرا بون، بەلام ئەوان لـە خۆبـایی بـون، بەڕاستی نەتەوەیەکی تاوانبار بون.

---

(١) قەلاچۆ: بنبڕکردن، لەناوبردن.

## ٣٣- دەرچون

خاکی میسر هەرچەندە بەرفرەوان بو، بەڵام بۆ نەوەی ئیسرائیل تەنگ و تریسك بو.

چ لە پیت و بەرەکەت و خێروبێری میسر بکەن کە ئەوان هەمو ڕۆژێ جۆرەها ئەشکەنجە و ڕیسوایی ببینن؟!

تا کەی ئارام بگرن؟ خۆ ئەوانیش ئادەمیزادن و هەست بە ئێش و ئازار دەکەن!

خوا سروشی بۆ موسا نارد شەوێ نەوەی ئیسرائیلیش لەگەڵ خۆی ببات و لە میسر دەرچن.

جەندرمەکانی فیرعەون کە وەك قەلەڕەش دەیانڕوانی و وەك مێرولان بۆنیان دەکرد هەستیان پێکرد و هەواڵیان بە فیرعەون ڕاگەیاند.

موسا نەوەی ئیسرائیلی لەگەڵ خۆی دا و بەرەو خاکی پیرۆز بەڕێکەوتن.

نەوەی ئیسرائیل دوازدە تیرە بون، هەر تیرەی فەرماندەیەکیان هەبو.

ڕێگای شام ڕێگایەکی دیار و ئاشکرا بو، وشکانیەك بو لە نێوان دو وشکانیدا، موسا پێشتر دو جارانی پێدا ڕۆیشتبو، جارێك کە بۆ مەدیەن کۆچی کرد، جارێکیتریش کە بۆ میسر گەڕایەوە.

بەڵام موسا مەبەستێکی هەیە کەچی خوا مەبەستێکیتری هەیە، هەڵبەت مەبەستی خوا دێتەدی.

موسا ڕێگای بزر کرد، موسا هەڵەی کرد و قەدەری خوا هاتەدی.

موسا وایدەزانی نەوەی ئیسرائیل بەرەو باکور دەبا بەڵام بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕۆیشتن[١]، چونکە شەوێکی تاریك و ئەنگوستەچاو بو.

لە ناکاو خۆیان لەبەردەم دەریای سور دیتەوە کە شەپۆلە هاروهاجەکانی لێکیان دەدا.

هاوار خوایە! ئێمە لە کوێین؟ لەبەردەم دەریا داین!

ئاوڕێکیان لە پشتەوە داوە، لە دورەوەڕا تەپ و تۆزێکی پەرش و بڵاویان بینی!

هەزارەزیلەی لەشکرێکی گەورەیان چاو پێکەوت کە بەری ئاسۆیان گرتبو!

لێرەدا نەوەی ئیسرائیل هەرا و زەنا و دەنگە دەنگیان لەناودا بەرز بۆوە و دەیانگوت:

کوڕی عیمران! لە چ لێمان توڕە بوی ئاوا نەخشەت کێشاوە بمانکوژی!

ئێمەت هێناوەتە سەر کەناری دەریا تا فیرعەون وەك مشك بمانکوژێ؟ تازە نەدەتوانین هەڵبێین! نەدەتوانین دەرباز بین!

ئێمە وەبیرمان نایێ خراپەمان لەگەڵدا کردبی ئەم تۆڵەیە لەسەر چی؟!

ئەم هەمو ماندوبون و دەردەسەریە بەس نەبو کە لەبەر تۆ تا ئێرە هاتوین؟!

ئەوەتانێ پێشمان دەریایە، پشتمان دوژمنە دەرەتانمان[٢] نیە دەبێ بمرین!

بەنیئیسرائیل دنیایان لەبەرچاوی تاریك بو، هیوابڕاو و هەناسەسارد بون، پاشان دەنگە دەنگ نەما و خامۆش بون.

---

(١) لێرەدا وا چاکە مامۆستا نەخشەی وڵاتی میسر بە قوتابیان نیشان بدات.

(٢) دەرەتان: ڕێی رزگاری.

ترس و لـەرزێکی زۆر دایگـرتن، لـە تەنگانـەی ناخۆشـدا ئەگـەر شـاخیش بلەخشێ[١] گازاندەی لێناکرێ.

بەڵام موسا بڕوای بە خوا بەهێز بو، بڕواکەی نەلەرزی، خەڵکەکە گوێبیـستی دەنگی بە سامی موسا بون کە فەرموی:

نەخێر...خوام لەگەڵدایە، خوا ڕزگارم دەکا.

خوا فەرمانی بە موسا کرد گۆچانێك لەئاوی دەریا بدا، ئـەویش گۆچـانێکی لێدا و دەریا لەت بو، لـە هـەردو لاوە ئاوەکـە وەك دو شـاخی زەبـەللاح قیـت ڕاوەستان.

ئاوەکە دوازدە ڕێگای لـێ بوەوە، هەر ڕێگایە و بۆ تیرەیەك.

بەمجۆرە نەوەی ئیسرائیل بە سـەلامەتی لـە دەریاکـە پەڕینـەوە و گەیـشتنە ئەوبەری بێمەترسی.

## ٣٤- خنکانی فیرعەون

فیرعەون نەوەی ئیسرائیلی بینی کە چۆن لە دەریا بەسەلامەتی پەڕینەوە.

فیرعەون بە سەربازەکانی گوت: تەماشاکەن، بۆ من دەریا چۆن شەق بـوە تـا ئەم هەڵاتوانە دەسگیر بکەم.

فیرعەون لەگەڵ سەربازەکانی بەرەو دەریا چونە پێـشەوە، نـەوەی ئیـسرائیل جارێکیتر ترس و لەرز دایگرتنەوە.

---

(١) لەخشین: خزین.

ئەوەتانێ دوژمن گەیشت! ئەوەتانێ ئەو ستەمکارە دەیەوێ بپەڕێتەوە، تازە تەواو هیچ شتێك نایگەڕێنێتەوە، دەمانگاتێ و هەموشمان دەگرێ، بە یەخسیری و بە سەرشۆڕی بەرەو میسرمان دەباتەوە یان هەر لێرە بە نامۆیی دەمانکوژێ.

موسا ویستی گۆچانێکی تر لە شوێنە وشکبوەکە بداتەوە و وەکو پێشوی لێبێتەوە، بەڵام خوا سروشی بۆ نارد و فەرموی:

واز لە دەریا بێنە فیرعەون و سەربازەکان نقوم دەبن.

فیرعەون و سەربازەکان خۆیان پێدادا و ویستیان بەهەمان شوێنی موسا بپەڕنەوە، ڕۆیشتن تا گەیشتنە ناوەندی دەریا، لەوێدا هەردو لەتەکەی دەریا خۆیان لێکدایەوە.

فیرعەون کە زانی تێکەوتوە سەرمەستبونەکەی نەما و بەهۆش خۆی هاتەوە، کە زانی وا نوقم دەبێ و دەخنکێ پەشیمان بۆوە و گوتی:

بڕوا بەو خوایە دێنم کە نەوەی ئیسرائیل بڕوایان پێهێناوە، منیش موسڵمانم!

بەڵام تازە کار لە کار ترازاوە و بواری تۆبە نەماوە، چونکە خوا تۆبە لەو کەسە وەرناگرێ کە خەریکە دەمرێ و ئاوزینگ دەدا ئەوجا دەڵێ خوایە پەشیمانم تۆبەم لێ قبوڵ بکە!

وێڕای ئەمە هەر کات سزای خوا هات، پەشیمانبونەوە بێهودەیە.

فیرعەونیش لەم حاڵەتەدا کەلە سەرەمەرگدا بو و سزای خوای توش ببو ئەوجا تۆبەی کرد و پەشیمانی خۆی دەربڕی، ئەوکاتیش پێیان گوت: هەی ستەمکار دەتەوێ ئێستا تۆبە بکەی؟ ئەدی بۆ پێشتر تۆبەت نەدەکرد؟ دەتەوێ

ئێستا بگەڕێیەوە؟ ئەدی بۆ پێشتر نەدەگەڕایەوە و دەستت لە ستەم هەڵنەدەگرت؟!

فیرعەون ئەو پاشا زۆردار و بە زەبروزەنگەی، کە هەزاران منداڵ و پیاوی سەربڕین و کوشتنی.

ئەو لەخوا یاخییەی کە هەزاران هەزار خەڵکی لەسێدارە دا.

لەناو دەریادا خنکا و مرد.

پاشا زۆردارەکەی میسر کە مرد لە بارەگاکەی دور بو، لە کۆشکەکەی دور بو، لە دەسەڵات و زەبر و زەنگەکەی دور بو.

پزیشك لەوێ نەبون چارەسەری بکەن، برادەر لەوێ نەبون دڵی بدەنەوە، کەس نەبو بۆی بگرییێ.

نەوەی ئیسرائیل گومانیان لە مردنی فیرعەون هەبو، دەیانگوت فیرعەون نامرێ، چونکە پێشتر دیومانە چەندین ڕۆژ نانی نەخواردوە و ئاوی نەخواردۆتەوە کەچی نەمردوە؟!..

بەڵام کە دەریا تەرمەکەی هەڵدایە دەرەوە گومانیان نەما.

خوا بە فیرعەونی گوت: ئەمڕۆکە دەخنکێی پاشان تەرمەکەت لە فەوتانێ ڕزگار دەکەین، تا بۆ ئەوانی دواوەی خۆت ببیە نیشانە و پەند وەرگرن.

ئەوەبو تەرمەکەی بوە پەند و نیشانەیەك بۆ هەموو خەڵك.

سەربازەکانی فیرعەون هەمویان خنکان و کەسیان دەرباز نەبو.

میسریان بەجێهێشت بێئەوەی بستە خاکێکیش ببێتە گۆڕیان.

لە دوای خۆیان گەلێك باخ و باخچە و ڕوبار و کانیاو و کشتوکاڵ و شوێنی خۆش و ناز و نیعمەتیان بەجێهێشت، پاشان کەسانێکیتر شوێنیان گرتنەوە.

نە ئاسمان شیوەنی بۆ گێڕان، نە زەمینیش... هەر مۆڵەتیشیان پێ نەدرا پەشیمان ببنەوە.

## ٣٥- لە چۆڵەوانیدا!

نەوەی ئیسرائیل لە ئاوەکە پەڕینەوە، بەسەلامەتی گەیشتنە سەر وشکانی، لەوێ بە ئازادی هەوای ئازادییان هەڵمژی.

لەوێ لە فیرعەون ناترسن، لە هامان ناترسن، لە جەندرمەکان ناترسن.

لەوێ بە ئارامی و بە دڵنیایی دەگەڕان و دەسوڕان، جگە لە خوا لە کەسیتر نەدەترسان.

نەوەی ئیسرائیل خەڵکی شار بون، لەم چۆڵیەدا تاوی ڕۆژێ ئازاری دەدان.

بەڵام ئەوان میوانی خوان! نەتدیوە پاشاکان چۆن ڕێز لە میوانەکانیان دەگرن؟!

چۆن ڕەشماڵیان بۆ هەڵدەدەن تا بە تاوی ڕۆژێ تاوەنگاز[1] نەبن؟!

ڕێزی خوا لە هەمو ڕێزێك گەورەترە!

خوا فەرمانی بە هەور کرد سێبەریان لێبکا، هەور سێبەری لێکردن، لەبەر سێبەر دەڕۆیشتن، بۆ هەر کوێ چوبان و لە هەور کوێ ڕاوەستابان هەور لەسەر سەریانەوە بو.

(١) تاوەنگاز: بەتاوی ڕۆژ سوتاندن.

نەوەی ئیسرائیل تینویان بو بەڵام ئاو لەم چۆڵیەدا نیە، ڕوبار و بیری لـێ نیە.

چونە لای موسا، وەك چۆن منداڵ ئەگەر تینوی بـێ پەنا دەباتە بەر دایکی و بۆ ئاو دەنوزێتەوە[1]، ئەوانیش ئاوەها پەنایان بـردە لای موسـا و داوای ئاویـان کرد.

موسا لـە پـەروەردگار پاڕایـەوە! جـا جگـە لـە خـوا کەسـیتر هەیـە لێـی بپاڕێتەوە؟!

خوا بە موسای فەرمو:

بە گۆچانەکەت زەبرێك لە بەردەکە بوەشێنە.

موسا زەبرێکی لە بەردەکە دا، بەردەکە دوازدە کانی لـێ هەڵقولا، خەڵکەکە ئاویان خواردەوە و تینوێتیان شکا.

ئەمجارە نەوەی ئیسرائیل برسییان بو، چونە لای موسا وەك چۆن منداڵ ئەگەر برسی بێ پەنا دەباتە بەر دایکی و بۆ نان دەنوزێتەوە، ئەوانیش ئاوەهـا پـەنایان بردە لای موسا و داوای نانیان کرد.

گوتیان: ئەی موسا تۆ لە میسر دەربەدەرت کردوین کە خـاکی میوەجـات و بەروبومی جۆراوجۆرە! کە خاکی پڕ لە خێر و بەرەکەتە! بەڵام لەم چـۆڵیەدا کـێ نان وخواردنمان دەداتێ؟

موسا لە پـەروەدگار پاڕایـەوە! جـا جگـە لـە خـوا کەسـی تـر هەیـە لیـێ بپاڕێتەوە؟! خوای پەروەردگار خواردنی بۆ دابەزاندن.

خوا لەسەر گەڵای داران شتێکی وەك حـەڵوای بـۆ ڕوانـدن، هـەروەها جـۆرە باڵندەیەکیشی بۆ ناردن کە بە ئاسانی لەسەر داران دەسگیر دەکران.

---

(١) نوزانەوە: کرِوزانەوە، دەنگی گریاناوی دەربرین.

حەڵواکە گەزۆ بو، باڵندەکەش شەلاقە[1] بو، خوا بەم جۆرە ڕێزی لێنان و میوانداری کردن.

## ٣٦- ناسوپاسگوزاری نەوەی ئیسرائیل

بەڵام نەوەی ئیسرائیل لەبەر کۆیلایەتی دێرینەیان چێژ و ڕەوشتیان تێکچو بو.

لەسەر هیچ شتێك سەقامگیر[2] نەدەبون، بە هیچ شتێك ئۆقرەیان نەدەگرت، سروشتیان وەك منداڵان وابو.

کەم سوپاسیان دەکرد و زۆر سکاڵایان دەردەبڕی و زو بێزار دەبون، حەزیان لەو شتە دەکرد کە لێیان قەدەغە دەکرا، ڕقیان لەو شتە دەبوەوە کە بۆیان ڕەوا دەکرا.

زۆری نەخایاند بە موسایان گوت:

ئێمە لەم خواردنە بێزار بوین، لەو گۆشت و حەڵوایە بێزار بوین.

حەزمان لە سەوزە و شینایيە.

ئێمە چیتر لەسەر ئەم خواردنە ئارام ناگرین، لە خوا بپاڕێوە سەوزە و ئارو و سیر و نیسك و پیازمان بۆ بڕوێنێ.

موسا سەری لەم داوایە سەیرە سوڕما! بە دەنگێکی ناڕازی ئامێز و بە سەرسوڕمانی و سەرکۆنەوە گوتی:

---

(١) شەلاقە: جۆرە باڵندەیەکە.

(٢) سەقامگیر: جێگیر و چەسپ.

ئێوە شتێکی چاکتر بە شتێکی چاك دەگۆڕنەوە ؟!

ئایا سەوزەواتتان لەباتی[1] باڵندە و حەڵوا دەوێ؟ کە دەستی هیچ کەسێکی پێ نەکەوتوە!

ئایا لەباتی خواردنی پاشایان داوای خواردنی جوتیاران دەکەن؟

بە ڕاستی چێژێکی بزڕکاوە! بەڕاستی هەڵبژاردنێکی خراپە!

بەڵام نەوەی ئیسرائیل لە داواکەیان دانەبەزین، بەردەوام داوای سەوزە و ئارویان دەکرد.

موسا گوتی: ئەوەی ئێوە داوای دەکەن لە هەمو گوند و ئاوەدانیەکدا هەیە.

بڕۆنە ناو ئاواییەك و لەوێدا دەستتان دەکەوێ.

## ٣٧- لاملیی نەوەی ئیسرائیل

نەوەی ئیسرائیل سرشتێکی[2] منداڵانەیان هەبو، وەك منداڵان لامل بون.

کە فەرمانێکیان پێدەکرا کارێك بکەن بە پێچەوانەی فەرمانەکە دەجوڵانەوە و گاڵتەیان پێدەهات.

وەك بڵێی بە واجبی بزانن بە پێچەوانەوە ڕەفتار بکەن.

وەك منداڵی لامل وابون کە ئەگەر پێی بڵێن هەڵسە دادەنیشێ ئەگەر پێشی بڵێن دانیشە هەڵدەستێ! ئەگەر پێی بڵێن بێدەنگ بە بدوێ، ئەگەر پێشی بڵێی بدوێ بێدەنگ بێ.

---

(١) لەباتی: لەجیاتی.

(٢) سرشت: تەبیعات، سروشت.

وەك منــداڵان لامــل بــون، بــەڵام وەك منــداڵان پــاك نــەبون، بــەڵكو وەك شەڕەنگێزان[1] دڵپیس بون، وەك دوژمنان بە لاقرتێ[2] و گاڵتەجار، وەكو شێتان گەمژە بون.

خۆیان دەیانویست بچنە ناو گوندێك و لەوێدا خواردنی بە تام و چێژ و سەوزە و ئارو بخۆن.

بەڵام کە پێیان گوترا: برۆنە ناو ئەم گوندە و لەوێ بە ئارەزوی خۆتان بە تێر و تەسەلــی چی دەخۆن بیخۆن.

بەڵام لە دەروازەی گوندەکەدا سوژدە بۆ خوا ببەن و بڵــێن لێمــان خــۆش بــە، خواش لە گوناهەکانتان خۆش دەبێ و ئەگەر چاکەش بکــەن خــوا بەخشــشێکی پترتان پێدەبەخشێ..

ئــەوان لــەم فەرمانــە خواییــە تــورە بــون، بــە دڵگرانــی و گاڵتــەجاڕی و قونەخشکەوە چونە ناو گوندەکە.

ئەوەی خوا پێی فەرمو بون وایان نەگوت و شتێکی تریان گوت.

بۆیە خوای گەورە سزای دان، دەرد و پەتایەکی وای لەناودا بڵاوکردنــەوە وەك مشك هەڵیدەوەراندن.

هەر فەرمانێکیان پێ بکرابوایە پرسیار و پرتە و بۆڵەیــەکی زۆریــان دەکــرد، وەك ئەو پیاوە وابون کە نایەوێ کار بکات بۆیە پرسیار و پرتــە و بۆڵەیــەکی زۆر دەکا.

---

(١) شەڕەنگێز: خراپەویست.

(٢) لاقرتێ: گەمە و گاڵتە.

# ٣٧- چێڵەکە

جارێکیان لەناو نەوەی ئیسرائیلدا پیاوێك کوژرا، نەوەی ئیسرائیل زۆریان پێناخۆش بو و نیگەران بون.

زۆریان هەوڵدا نەیانزانی بکوژ کێیە، لەناو خەڵك باس باسی بکوژ بو.

هاتنە لای موسا- درود و سڵاوی خوای لێبێ - گوتیان:

ئەی پێغەمبەری خوا ئەم کێشەیەمان بۆ چارەسەر بکە و لە خوا بپاڕێوە بکوژمان بۆ ئاشکرا بکات.

موسا لە خوا پاڕایەوە بکوژیان بۆ ئاشکرا بکات، خوا سروشی بۆ نارد و پێی فەرمو: با چێڵێك سەربڕن.

لێرەدا بەزم و بەڵا دەستی پێکرد، نەوەی ئیسرائیل فەرمانەکەیان بە سادەیی وەرنەگرت و لە خۆیان ئاڵۆز کرد، پرسیار لە دوای پرسیار تێهەڵدەچونەوە[1] پاشان کە وەڵامەکەشیان وەردەگرت گاڵتەیان پێدەهات.

موسا پێی گوتن: خوا دەفەرموێ: چێڵێك سەربڕن.

گوتیان: دیارە گاڵتەمان پێدەکەی!

موسا گوتی: پەنا بەخوا! من گاڵتەجار نیم.

پاشان گەلێك پرسیاری تریان کرد.

گوتیان: لە خوا بپاڕێوە بۆمان ڕون بکاتەوە داخوە چێڵەکە چۆنە؟

موسا گوتی: خوا دەفەرموێ: چێڵێکی نە پیر و نە جەوانە بەڵکو تەمەنێکی مامناوەندی هەیە، فەرمانی خوا جێبەجێ بکەن و چیتر پرسیاران مەکەن.

(١) تێهەڵچونەوە: سەرلەنوێ قسەلێکردنەوە.

بەڵام نەوەی ئیسرائیل بەم پرسیارەش نەوەستان، ئەمجارە لەبارەی ڕەنگی چێڵەکەیان پرسی و گوتیان:

لە خوا بپاڕێوە بۆمان ڕون بکاتەوە داخوە ڕەنگەکەی چۆنە؟

موسا گوتی: خوا دەفەرموێ: چێڵێکی ڕەنگ زەردی تۆخە، هەرکەسێك بیبینێ دڵی پێدەکرێتەوە.

ئەمجارە هیچ پرسیارێکی دیاریکراویان بۆ نەهات بۆیە پرسیارێکی گشتییان کرد و گوتیان:

لە خوا بپاڕێوە بۆمان ڕون بکاتەوە داخوە چ نیشانەیەکیتری هەیە؟ چونکە بەڕاستی سەرمان لێ شێوایە و نازانین چ چێڵێکی مەبەستە، بە تەمای خوا! بەڵکو ئەمجارە ڕێنوێن دەبین.

موسا گوتی: خوا دەفەرموێ: چێڵەکە زەوی نەکێڵاوە و کشتوکاڵی ئاو نەداوە، ساغ و سازە و پێستەکەشی هیچ پەڵەموی زرەڕەنگی لێ نەڕواوە.

لەبەر ئەوەی لەگەڵ پرسیارەکەدا گوتیان: بەتەمای خوا بەڵکو ئەمجارە ڕێنوێن دەبین، هەر بۆیە ئەمجارە ڕێنوێن بون و، چێڵەکەیان بە تەواوی ناسی و بەرچاویان ڕون بو.

بەڵام لەبەر پرسیارەکان چارەسەرەکەیان لێ سنوردار بو، خۆ ئەگەر لەسەرەتادا هەر چێڵێکیان سەربڕی بوایە داخوازیەکەیان دەهاتە دی و بکوژیان بۆ ئاشکرا دەبو، بەڵام چارەکەیان لە خۆ ئاڵۆز کرد بۆیە خوا لێی توند کردن.

بەدوای سۆراخی چێڵێك گەڕان ڕەنگەکەی زەردێکی تۆخ بێ، زەوی نەکێڵا بێ، ئاوی نەگێڕا بێ، ساغ و ساز بێ، پەڵەموی زرەڕەنگی لێ نەڕوا بێ!

بێگومان ئەم جۆرە چێڵە زۆر دەگمەنە و بە هەزار و یەك زەحمەتی ئەگەر بدۆزرێتەوە.

چونکە چێڵ هەیە بەڵام یان پیرە یان جەوانە، تەمەن مامناوەندی نیە.

چێڵ هەیە تەمەنی مامناوەندییە بەڵام ڕەنگی زەرد نیە.

چێڵ هەیە تەمەنی مامناوەندی و ڕەنگ زەردە بەڵام زەردەکەی تۆخ نیە.

چێڵ هەیە تەمەن مامناوەندی و ڕەنگ زەردی تۆخە بەڵام زەوی و زاری پێ کێڵدراوە.

چێڵ هەیە تەمەن مامناوەندی و ڕەنگ زەردی تۆخە و زەویشی نەکێڵاوە بەڵام ئاوگێڕی پێ کراوە و کشتوکاڵی پێ ئاو دراوە!

زۆر گەڕان و سوڕان، گەلێکیان لەم و لەو سۆراخ کرد و پرسی، ئەم گەڕان و سوڕان و سۆراخ و پرسینە تەواوێك ماندوی کردن.

خوا ویستی چاکەیەك لەگەڵ هەتیوێك بکا، چێڵەکەیان لە لای ئەم هەتیوە دۆزیەوە، چێڵەکەیان بە نرخێکی زۆر گران لێ کڕی.

دوای ئەم هەمو بەزم و بەڵایە چێڵەکەیان هێنا و سەریان بڕی، خۆ ئەوکاتیش خەریکبو سەری نەبڕن و بەزمێکی تر بنێنەوە!

خوا فەرمانی پێکردن کوژراوەکە بە بەشێکی کەلەشی چێڵەکە دابهێنن، ئەنجا کوژراوەکە زندو دەبێتەوە و بکوژەکە ئاشکرا دەکا.

ئەوانیش وایان کرد و بکوژەکە ئاشکرا بو.

## ٣٨- شەریعەت

بەنی ئیسرائیل لە ژیانی ئاژەڵانەوە ڕزگار بون، دەستیان پێکرد وەك خەڵك ژیانیان بەسەر دەبرد.

لەم چۆڵیەدا بە سەربەستی و بە سەربەزری دەگوزەران.

لەوێدا پێویستیان بە شەریعەتێکی خوایی بو تا حوکمیان بگێڕێ و ڕێگایان بۆ ڕوناك بکاتەوە.

مرۆڤ بەبێ شەریعەت و روناکی خوایی ناتوانێ وەك مرۆڤ بژی.

جیهان هەموی تاریکی لەناو تاریکیە، مەگەر ئەوانەی کە خوا ڕوناکی پێبەخشیون.

ئەو روناکیەش تەنها ڕوناکی پێغەمبەرانە و خەڵکی لەبەردا ڕێنوێن دەبێ.

هەر کەسێ بەم ڕوناکیە ڕێنوێن نەبێ بێگومان لە گومڕاییدا دەبێ و ڕەمەکیانە پەل دەکوتێ.

بیروباوەڕ - بەبێ ئەم ڕوناکیە - خەیاڵات و ئەفسانەیەکی هێند پوچ و پوکە تەنانەت منداڵانیش گاڵتەیان پێدێ.

هەڵبەت گوێتان لە بیروباوەڕ و ئەفسانە و قسەپوچەکانی هاوبەشپەرست و بێبڕواو جولەکە و گاورەکان بوە؟!

زانست ـ بەبێ ئەم ڕوناکیە ـ دەبێتە گومان و مەزندە[1] و ڕاڕایی[2]، وە دوای گومانان وێڵ دەبێ، گومانیش هەرگیز ڕاستەقینە ناخاتە ڕو.

---

(١) مەزندە: خەملاندن بە مێشك.

(٢) ڕاڕایی: دودڵی.

ڕەوشت ـ بە بێ ئەم ڕوناکیە ـ یان زێدەڕۆییە یان بەزایەدانە! یان کەموکورتە یان لەڕاستەڕێ لایداوە!

بێگومان بینیوتانە ئەو کەسانەی ڕێبازی پێغەمبەرانیان نەگرتوە چۆن مافی خەڵك پێشێل دەکەن؟ چۆن دەستدرێژی دەکەن؟ چۆن وەدوای هەوەست و ئـارەزو کەوتون؟

رامیاری و فەرمانڕەوایی ـ بەبێ ئەم ڕوناکیە ـ ستەمکاری و چەوسـانەوەیە، بە فیڕۆدانی ماڵ و ماف و خوێنی خەڵکە.

بێگومان بینیوتانـە ئـەو فەرمانڕەوایانـەی کـە لـە خـوا ناترسـن و شـوێن شەریعەتی خوا نەکـەوتون چـۆن لـە ئەرکـەکانیان گـزی دەکـەن؟ چـۆن مـاڵ و دەرامەتی خەڵك تەخشان و پەخشان[1] دەکەن؟ چۆن خوێن و مافی خەڵك بە فیڕۆ دەدەن؟

بێگومان بینیوتانە چۆن خەڵکیان کردۆتە کۆیلە؟ چۆن جـەماوەریان کردۆتـە چەندین کۆمەڵی دژ بەیـەك؟ چـۆن پیاوانیـان کوشـتون و ئافرەتانیـان کردۆتـە خزمەتکار؟

دەزانی لە هەردو جەنگی جیهانیدا چەند کەس کوژران و بریندار بون؟[2]

(١) تەخشان و پەخشان: بە فیڕۆدان، پاکوپوك کردن.

(٢) بۆ مامۆستا: ژمارەی کوژراو و برینداران‌ی جەنگی یەکەمی جیهانی(١٩١٤-١٩١٨) بە گوێرەی لێکۆڵینـەوەکانی سیاسـەتمەدار و شـارەزای ئینگلیـزی(تـالیس تاوسـەند) بریتیـە لە(٣٧,٥١٣,٨٨٦)کەس، کوژراوەکان(٨,٥٤٣,٥١٥) کەس بون. هەروەها نـائیبی بـەریتانی (مستەر میکستن)لێکی داوەتەوە کە ژمارەی کوژراو و برینداران‌ی جەنگی دوەمی جیهانی لـە پەنجا ملیۆن کەس کەمتر نیە.

جیهان هەموی تاریکی لەناو تاریکیە تەنها ئەوانە نەبن کە خوا ڕوناکایی پێبەخشیون.

جیهان هەموی تاریکی لەسەر تاریکیە، کەس بەرپێی خۆی نابینێ، کەس بەرچاوی ڕوناك نیە مەگەر ئەوانەی کە خوا ڕوناکایی پێبەخشیون. ئەگەر خواش ڕوناکاییان پێنەبەخشێ هەرگیز بە هیچ ڕوناکاییەکیتر ڕێیان ڕوناك نابێتەوە.

پێغەمبەران بۆ ئەوە هاتون تا خەڵك فێری خواپەرستی بکەن، تا فێری هەڵسوکەوتیان بکەن، تا فێری داب و نەریتی ئاین و ژینیان بکەن، تا فێری داب و نەریتی خواردن و خواردنەوە و نوستن و دانیشتنیان بکەن، تا فێری هەمو داب و نەریتێکی چاکیان بکەن.

باوکێکی بەسۆز چەند لە خەمی جگەرگۆشەکانی[1] دایە تا فێریان بکات، پێغەمبەرانیش ئاوەها لە خەمی خەڵك دان تا فێریان بکەن.

خەڵك لە منداڵیدا چەند پێویستی بە پەروەردەی باوك هەیە، لە گەورەییشدا پتر پێویستی بە پەروەردەی پێغەمبەران هەیە.

ئەوانەی پەروەردەی پێغەمبەرانیان وەرنەگرتوە و داب و نەریتی پێغەمبەران فێر نەبونە، وەك ئەو دارە وان کە لە بیابانەدا بە بێ باخەوان دەڕوێ و گەورە دەبێ، بۆیە خوار و خێچ و دڕکن و گەندەڵ دەبێ.

---

(١) جگەرگۆشە: منداڵ.

## ٣٩- تەورات

خوا ویستی نەوەی ئیسرائیل وەکو ئەو نەتەوانە نەبن کە بەبێ پەیام و ڕێنوێنی خوا سەرگەردان بون.

ویستی وەك ئەو نەتەوانە نەبن کە بەبێ بەرنامە و ڕەمەکیانە[1] ژیاون.

خوا فەرمانی بە موسا کرد خۆی بشوات و پاشان سی (٣٠) ڕۆژ بەڕۆژو بێ، پاشان بچێتە شاخی سینایێ تا لەوێدا خوا قسەی لەگەڵ بکات و پەرتوکێکی پێببەخشێ و ببێتە بەرنامەی ژیانیان.

موسا لەناو نەتەوەکەیدا حەفتا پیاوی هەڵبژارد و لەگەڵ خۆی بردن تا ببنە شاهێد، چونکە نەوەی ئیسرائیل نەتەوەیەکی مێشك وشك بون و زو بێبڕوا دەبون.

بە هارونی براشی گوت: براکەم! تۆ لە جێی من بە و ئاگات لە نەتەوەکەم بێت و ڕێگەی چاکیان نیشان بدە، نەکەی وەشوێن کاری بەدکاران بکەوی.

موسا بۆیە هارونی کردە جێنشینی خۆی چونکە هەمو کۆمەڵێك دەبێ پێشەوایەکی هەبێ بەرچاویان ڕوناك بکاتەوە.

موسا لەگەڵ حەفتا پیاوەکەدا بەرەو وادەگای پەروەردگار بەڕێ کەوتن.

بەڵام موسا زۆر بە پەرۆش و تامەزرۆی لای پەروەردگاری بو، بۆیە پەلەی کرد و پێشی وان گەیشتە شاخەکە.

خوا فەرموی: ئەی موسا لەبەر چ وا بە پەلە هاتی و پێش نەتەوەکەت کەوتی؟

---

(١) ڕەمەکیانە: بەبێ پیلان و بەرنامە، عەشوائی.

گوتی: ئەی پەروەردگار ئەوانیش هێندەی پێناچێ دەگەنە جێ، بەڵام بۆیە بەپەلە هاتومە لات تا تۆ لێم ڕازی بی.

خوا فەرمانی بە موسا کرد ماوەی چل شەوان لە وادەگای[1] پەروەردگاریدا بمێنێتەوە.

موسا گەیشتە شاخی سینا، خوا قسەی لەگەڵدا کرد و نزیکی کردەوە، موسا زیاتر تامەزرۆی خوا بو.

گوتی: خوایە حەز دەکەم بتبینم.

خوا دەیزانی موسا ناتوانێ بیبنێ چونکە لە دنیادا هیچ کەسێك ناتوانێ خوا ببینێ، بەڵام خوا هەمو کەسێك دەبینێ.

شاخەکان ناتوانن بەرگەی وتەکانی خوا بگرن چ جای بەرگەی ڕوناکیەکەی.

خوا لە قورئاندا دەفەرموێ: ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندبایە سەر هەر شاخێك ئەوا شاخەکە ترس و سامی لێدەنیشت و لە ترسی خوا شەق شەق دەبو.

بۆیە خوا بە موسای فەرمو: ئەی موسا تۆ ناتوانی بمبینی، بەڵام تەماشای ئەم شاخە بکە ئەگەر خۆی ڕاگرت و مایەوە ئەوا دەتوانی بمبینی.

خوا خۆی بە شاخەکە نیشان دا، شاخەکە دەسبەجێ وردوخاش بو. موسا کە ئەمەی دیت ڕاچەنی[2] و بە بێهۆشی کەوتە سەر زەوی.

موسا دوای ئەوەی کە بە هۆش خۆی هاتەوە گوتی:

خوایە پاك و بێگەردی بۆ تۆ، پەژیوانم، من بەر لەنەتەوەکەم بڕوام بە سام و هەیبەت و گەورەیی تۆ هێناوە.

---

(١) وادەگا: ئەو شوێنەی خوا دیاری کردبو تا لەگەڵ موسادا بدوێ.

(٢) ڕاچەنی: ڕاجفری.

خوا فەرموی: ئـەی موسـا مـن لـەناو خەڵكیـدا تـۆم بـۆ پێغەمبەرایـەتی هەڵبژرادوە و بەبێ پەردە قسەم لەگەڵدا كردوی، ئەم تەختانە وەرگرە و سوپاسـی خوا بكە.

موسـا تەختـەكانی لـە خـوا وەرگـرت، تەختـەكان هەرچـی ئامۆژگـاری و ڕونكردنەوەی پێویست بو بۆیان تێیدا بو.

خوا فەرموی: تەختەكان بە توندی وەرگرە و بە نەتەوەكەشت بڵێ كام فەرمان پاداشتی گەورەترە ئەو جێبەجێ بكەن.

موسا كاتەكەی لەگەڵ خوا تەواو بو و گەڕایەوە لای حـەفتا پیاوەكـە و ئـەو نیعمەتانەی خوا لە گەڵیدا كردبو پێی ڕاگەیاندن.

بەڵام ئەوان بەبێ شەرم و بەبێ مـنەتیەوە گوتیان:

تا خوا نەبینین بڕوات پێناكەین.

خوا لەو بێشەرمی و بێمنەتیـەی ئـەوان تـوڕە بـو، هەورەتریـشقەی بەسـەر داهێنان و گەلێكی لـێ‌كوشتن.

دیتیان وا ناتوانن بەرگەی هەورەتریشقە بگرن كە خوا ئەفراندوێتی، جا چـۆن دەتوانن بەرگەی ڕوناكی خوا بگرن!

موسا لەپەروەردگاری پاڕایەوە و گوتی:

پەروەردگارا! ئەگەر بتویستبایە پێشتر ئـەوانیش و منیـشت لـەناو دەبـرد، خوایە سزامان مەدە و لەبەر كاری گەمژە و نەزانان لەناومان مەبە.

خوا نزاكەی موسای قبوڵ كرد و مردوەكانی زندو كردەوە تابـەڵكو سوپاسـی خوا بكەن.

## ٤٠- گۆلك[١]

بەنی ئیسرائیل رۆژگارێك بو لەگەڵ هاوبەشپەرستان لە میسردا دەژیان.

قیبتیەکان لە میسردا گەلێ شتی جۆراوجۆریان دەپەرست و نەوەی ئیسرائیلیش بە چاوی سەر دەیانبینی.

لەبەر ئەوە نەوەی ئیسرائیل رکوکینەیان بەرامبەر بە هاوبەشپەرستی نەما بو.

وەك چۆن کە ئاو لە بان[٢] دیواری خانوێکی کۆن و کەلاوە دزە دەکاتە ژورەوە، ئەوانیش ئاوا خۆشویستنی هاوبەشپەرستیان چوبوە دڵی.

هەر جارێك کە دەرفەتێکیان بۆ هەڵدەکەوت وەك چۆن کە ئاو لە نشێوی لێژ دەبێتەوە، ئەوانیش یەکسەر بەرەو هاوبەشپەرستی لێژ دەبونەوە.

نەوەی ئیسرائیل دڵیان لە هەق تاری ببو، چێژ و ئارەزویان گەنی ببو، ئەگەر رێگەی راست و چاکیان بدیبایە لامل دەبون و هەنگاویان بۆ هەڵنەدەهێنا، بەڵام کە رێگەی ناراست و خراپیان دەدی هەر زو ملی رێیان دەگرت.

کاتێك لە دەریا پەڕینەوە بەلای خەڵکێکدا رابورین بتیان دەپەرست.

گوتیان: ئەی موسا تۆش وەکو ئەم خەڵکە بتێکمان بۆ دروست بکە تا بیپەرستین.

موسا تورە بو و گوتی: بەراستی ئێوە نەزانن.

زۆر سەیرە! ستەمە بەراستی ستەمە! خوا نیعمەتی لەگەڵ کردون و لەناو نەتەوەکانی ئەم رۆژگارە ئێوەی هەڵبژاردوە و شتی وای بە ئێوە بەخشیوە بە هیچ

---

(١) گۆلك: گوێرەکە.

(٢) بان: سەر.

نەتەوەیەکی تری نەبەخشیوە.

من چۆن داواتان لێدەکەم جگە لە خوا خواوەندیتر بپەرستن.

موسا کە چوە شاخی سینایێ و ماوەی چل ڕۆژ لێیان دابڕا، دیسان کەوتنە داوی شەیتان و بونە نێچیری هاوبەشپەرستی.

پیاوێکیان تێدا بو ناوی (سامری)بو، سامری هەڵسا پەیکەری گوڵکێکی بۆ دروست کردن، گوڵکەکە بارەباڕی لێوە دەهات، گوتی:

ئەمە خواوەندی ئێوە و خواوەندی موسایە بەلام موسا لەبیری چوە.

نەوەی ئیسرائیل بەم گوڵکە خەڵەتان و وەك کوێر و کەڕ سوژدەیان بۆ دەبرد.

بیریان نەدەکردەوە ئاخر ئەم پەیکەرە نە وەلامیان دەداتەوە، نەقازانج و نە زیانیان پێنابەخشێ، لە گەڵیان نادوێ، ڕێی ڕاستیان بۆ ڕانانوێنێ!، ئاخر چۆن سوژدەی بۆ دەبەن!!

هارون گەلێکی ئامۆژگاری کردن و زۆری لەگەڵ هەوڵ دان.

پێی گوتن: نەتەوەکەم! ئێوە بەم پەیکەرە خەڵەتاون، ئەم گوڵکە خواوەند نیە خواوەندی ئێوە خوای میهرەبانە، وەرن بە قسەی من بکەن، فەرمانی من جێبەجێ بکەن.

بەلام نەوەی ئیسرائیل بە جادوەکەی سامری چاوبەستی ببون[1] و خۆشەویستی گوڵکەکەیان چوبوە دڵی بۆیە گوتیان:

نەخێر تا موسا دێتەوە هەر دەیپەرستین.

---

(١) چاوبەستی بون: شت نەدیتن.

## ٤١- ســـزا

خوا بە موسای گوتبو کە سامری نەوەی ئیسرائیلی گومڕا کردوە بۆیە بە ئاخ و داخێکی زۆرەوە گەڕایەوە لای نەتەوەکەی.

موسا لە نەتەوەکەی زۆر تورە بو، لە هارونیش تورە بو.

گوتی: هارون! کە نەوەی ئیسرائیلت دیت گومڕا دەبن بۆ چی شوێنم نەکەوتیت؟ ئاخۆ تۆش لە فەرمانی من سەرپێچیت کرد؟!

هارون تەوازۆی[1] خواست و گوتی: براکەم! لەبەر ئەوە هەڵوێستم وەرنەگرت نەبادا هەندێك لێم یاخی بن و لە ئەنجامدا شەڕ و هەرا بەرپا ببێ و تۆش پێم بڵێی قسەی منت جێبەجێ نەکرد و نەتەوەکەمت پارچە پارچە و لێك ناکۆك کرد، پاشان دەرەقەتیشیان[2] نەهاتم و خەریکبو بشمکوژن.

موسا گوتی: خوایە لە من و لە براکەم خۆش بە و بمانخە ناو بەزەیی خۆت، تۆ لە هەمو کەس بەبەزەیی تری.

پاشان موسا ڕوی کردە سامری و گوتی:

ئەی سامری! ئەوە چیتە؟ بۆ ئەم خەڵکەت وا بە گومڕا بردوە؟

سامری دانی بە تاوانەکەی خۆی ناو گوتی:

دەرونم وای بۆ ڕازاندمەوە کە ئەم کارە بکەم.

موسا گوتی: بڕۆ لەناوماندا نەمینێی، دەشێ تا لەژیانیشدا مابی هەر بڵێی توخنم مەکەون.

---

(١) تەوازۆ: پۆزش، عوزر.

(٢) دەرەقەت: دەروەست.

موسا سزای دا بە تەنیایی بێ، بە تەنیایی بڕوا، بە تـەنیایی بگـوزەرێ، وەك دڕندە نە برادەر بێ نەبرادەریشی هەبێ.

جا چ سزایەك لەم سزایە گەورەترە؟!

ئەو کەسەی هەزاران کەسی توشی هاوبەشپەرستی کـردوە پێویـستە خـەڵك بێزی لـێبکەنەوە و تف و نەفرەتی لـێبکەن.

ئەو کەسەی خەڵکی لە خوا دور خستۆتەوە پێویستە لە خەڵك دور خرێتەوە.

ئەو کەسەی لە زەوی خوادا بانگەوازی بۆ هاوبەشپەرستی کردوە تاوانبـارە و پێویستە سەرتاسەری زەوی لـێ بکرێتە بەندیخانە.

پاشان موسا تەماشای گۆلکە نەفرەتیەکەی کرد و فەرمانی کرد بیـسوتێنن، ئەوانیش سوتاندیان و پاشان لەناو دەریادا پەرش و بڵاویان کردەوە.

نەوەی ئیسرائیل چارەنوسی گۆلکە پەرستراوەکەیان بینی، هـەروەها بینیـان چەند بێدەسەڵات و بێتوانایە.

پاشان موسا ڕوی کردە نەوەی ئیسرائیل و پێیگوتن:

نەتەوەکەم! ئێوە کە ئـەم گۆلکـەتان پەرسـتوە سـتەمتان دەرهـەق[1] بـەخۆ کردوە، جا وەرن بۆ لای خوا ژیوان ببنەوە و خۆتان بکوژن، ئەگەر وا بکەن باشترە و لەلای خوادا قبوڵن.

ئەوانیش وایان کرد، ئەوانەی گۆلکەکەیان نە پەرستبو گۆلك پەرسـتەکانیان کوشت و خوا بەم جۆرە تۆبەی لـێ قبوڵ کردن.

خوا لە قوڕئاندا دەفەرموێ:

---

(١) دەرهەق: لەمەڕ، بەرامبەر بە.

ئەوانەی گۆلکەکەیان کردە خواوەند و پەرستیان ئەوا لە دنیادا تورەیی خوایان توش دەبێ و دوچاری ڕیسوایی دەبن، ئێمە بەم جۆرە سزای بێبڕوایان دەدەین.

بەمجۆرە گۆلکپەرستەکان تا ڕۆژی دوایی هەر ڕیسوا و سەرشۆڕن! هاوبەشپەرستەکان تا ڕۆژی دوایی هەر ڕیسوا و سەرشۆڕن!

## ٤٢- ترسنۆکایەتی نەوەی ئیسرائیل

نەوەی ئیسرائیل لە میسردا هەر لەسەر کۆیلایەتی و ڕیسوایی و زەبونی پەروەردە ببون، منداڵەکان هەر بەم جۆرە گەورە ببون و گەنجەکانیش هەر بەم جۆرە پێراگەیشتبون، دەماری مەردایەتیان وشك ببو.

وایان لێهاتبو قەت بە خەونیش بیر لە باڵادەستی نەکەنەوە، قەت باسی جیهاد و تێکۆشانیان نەدەکرد.

نەوەی ئیسرائیل لە خاکی غوربەتدا بەبێ نیشتمان و فەرمانڕەوایەتی ڕۆژانی ژیانیان بەسەر دەبرد.

موسا بە سروشێکی خواییەوە ویستی لەگەڵ نەتەوەکەی بچێتە ناو خاکی پیرۆز و لەوێدا وەك پاشا و سەربەستان نیشتەجێ بن.

بەڵام موسا بە سروشتە لاواز و ترسنۆکەکەی نەوەی ئیسرائیل ئاگادار بو.

بۆیە ویستی تامەزرۆیان بکات و کارەکەیان لەبەرچاو ئاسان بکات.

لەبەر ئەوەی نەتەوەیەکی بەهێز و بە زەبروزەنگ و توندوتیژ دەستیان بەسەر خاکی پیرۆز داگرتبو.

نەوەی ئیسرائیل تا ئەم نەتەوەیە دەرنەکەن ناتوانن بچنە ناوی.

موسا باسی نیعمەتەکانی خوای بۆ دەکردن کـە لـە گەڵیـدا کـردون، تـا بـۆ جیهادی ڕێـی خـوا دەمـاری مەردایـەتیان ببـزوێ و بێـز لـەم ژیانـە زەبـون و ناشایستەیە بکەنەوە.

پێی گوتن: نەتەوەکەم! یادی نیعمەتەکانی خوا بکەنەوە کـە لەگـەڵ ئێوەیـدا کردوە، سەیر کەن بزانن خوا چەندین پێغەمبەر و پاشای لەناو ئێوە پەیدا کردوە، شتی وای بە ئێوە بەخشیوە بە کەسی تری نەبەخشیوە.

پاشان پێیگوتن: ئەوەتانێ خاکی پیرۆزتان لەبەرچاو دایە، هـیچ چـارەیەکتان نیە دەبێ ڕاپەڕن و لە دەست دوژمنانی دەربێنن.

خوا سەرکەوتنی بۆ ئێوە نوسیوە، ئەگەر خواش شتێکی بۆ یـەکێك نوسـیبێ زۆر بە هاسانی وەدەستی دێنێ، قەدەری خواش ڕەتبونەوەی بۆ نیە.

دەی نەتەوەکەم ڕاپەڕن بەرەو خاکی پیرۆز کە خوا سەرکەوتنی بۆ نوسیون.

موسا لەوە دەترسا سروشتە ترسنۆکەکەیان بەسەردا زاڵ بێ.

بۆیە پێیگوتن: نەتەوەکەم! نەکەن لـە دوژمـن هـەڵبێن و پـشت هەڵبکـەن، چونکە ئاوا شکست دەخۆن و دەدۆڕێن.

ئەوەی موسا لێی دەترسا ڕوی دا، دوای ئەوەی موسا ئەو هـەموەی لەگەڵـدا گوتن ئەوجا ئەوان زۆر بە نامەردی وەڵامیان دایەوە و گوتیان:

ئەی موسا! نەتەوەیەکی بە زەبروزەنگ و توندوتیژی لێیە، تا ئەوان دەرنەچن ئێمە ناچینە ژورەوە.

پاشان زۆر بە کزی گوتیان: کەنگێ دەرچون ئەوکات دەچینە ناوی.

دو پیاو کە لە خوا ترس بون و نیعمەتەکانی خوایان لەبەرچاو بو هەڵسانەوە و گوتیان:

خەڵکینـە لـە دەرگاکـەوە وەژورێ کـەون، کـە چـونە ژورەوە بێگومـان بـن سەردەکەون، پشت بە خوا ببەستن ئەگەر بڕواتان بەخوا هەیە.

بەڵام ئەمەش کاری تێنەکردن و گوتیان:

ئەگەر هەر چاری ناچارین بچینە ناوی تۆ بە موعجیزەیەك بڕۆ ناوی، جا کـە دیمان چویە ناوی ئێمەش دوابەدوای تۆ بە هێمنی و سەلامەتی دێینە ناوی.

گوتیان: ئەی موسا! تا ئەو نەتەوە بە زەبروزەنگەی لـێبێ مەحاڵـە بـچینە ناوی، تۆ بڕۆ بەیارمەتی خواکەت شەڕ بکە، ئێمە وا لێرە دانیشتوین.

لێرەدا موسا لێیان توڕە و بێهومێد بو، گوتی:

خوایە من دەسەڵاتم تەنها بەسەر خۆم و براکەمدا دەشکێ، بۆیە لـەم نەتـەوە بەدکارە جوێمان بکەوە.

خوا فەرموی: ئەی موسا تا ماوەی چڵ ساڵان خاکی پیرۆزیان لـێ حەرامـە و نابـێ بچنە ناوی، با هەر بە سەرگەردانی بمێننەوە، تۆش ئەسـەف لـە کەسـانی بەدکارو دورلەخوا مەخۆ.

خوا لەبەر ئەوە ماوەی چڵ ساڵی دانا چونکە لەم ماوەیەدا ئەو نەوەیـەی لـە میسر لەسەر کۆیلایەتی و ڕیسوایی گەورە ببون دەمرن و نەوەیەکیتر پەیدا دەبن کە لەسەر توندوتیژی و ناخۆشی پەروەردە دەبن، ئەوان نەتەوەی دوا ڕۆژن.

بەڵـێ لە هـەمو ڕۆژگارێکـدا ئەمـە چارەنوسـی جولەکەکانـە کـە هـەردەم نەتەوەیەکی سەرگەردان بوینە و لە کۆیلایەتی و ڕیسوایی ژیاون.

## ٤٣- لە پێناو زانستدا

پێغەمبەرﷺ لە فەرمودەیەکدا دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

جارێکیان موسا وتاری بۆ نەوەی ئیسرائیل دەدا.

یەکێك لێی پرسی: کێ لە هەمو کەس زاناترە؟

موسا گوتی: من لە هەمو کەس زاناترم!

لەبەرئەوەی زانستەکەی بۆ لای خوا نەگەڕاندەوە خوا سەرکۆنەی کرد.

خوا سروشی بۆ موسا نارد و پێی فەرمو لە شوێنی پێکگەیشتنی دو دەریادا بەندەیەکم هەیە لە تۆ زاناترە.

موسا گوتی: خوایە چۆن دەیگەمێ؟

پێیگوترا: برۆ و ماسیەکیش لەناو زەمبیلێك لەگەڵ خۆت هەڵگرە لە کوێ ماسیەکەت لێ ون بو لەوێ بەندەکەم دەدۆزیەوە.

موسا لەگەڵ غولامەکەی ـ کە ناوی یوشەعی کوڕی نون بو ـ بەڕێکەوتن لەناو زەمبیلێکیش ماسیەکیان لەگەڵ خۆبرد.

ڕۆیشتن تا گەیشتنە لای گاشەبەردێك[1] لەوێ سەریان بە بەردەکە کرد و نوستن.

ماسیەکە لە زەمبیلەکە هاتە دەرەوە و چۆوە ناو دەریا، کە ئەمەش سەیروسەمەرە بو بۆ موسا و غولامەکەی.

پاشان کە لە خەو هەڵسان ملی ڕێگەیان گرتەبەر و ئەوەندە شەوەی مابو هەر ڕۆیشتن.

---

(١) گاشەبەرد: بەردی زل.

کە بەیانی داهات موسا بە غولامەکەی گوت:

خواردن بێنە با بیخۆین لەم سەفەرەدا زۆر ماندو بوین.

موسا هەستی بە ماندوێتی نەدەکرد تا لەبەردەکە تێنەپەڕین.

غولامەکەی گوتی: بەبیرتە کە لای گاشە بەردەکە سەرخەوێکمان شکاند، لەوێ ماسیەکەم لەبیر کرد.

موسا گوتی: ئەوەیە کە مەبەستمانە!

لەوێوە ڕێ و ڕێ گەڕانەوە تا گەیشتنەوە لای گاشەبەردەکە.

لەوێ پیاوێکیان بینی خۆی بە جلێك داپۆشی بو.

موسا سلاوی لێکرد.

خدر گوتی: خەڵکی ئەم ناوچەیە نازانن سلاو بکەن، چۆن تۆ سلاو دەکەی؟

موسا گوتی: من موسام!

گوتی: موسای نەوەی ئیسرائیل؟

گوتی: بەڵێ!

موسا گوتی: ڕێگەم پێدەدەی لە گەڵت بم تا هەندێکم لەو زانستە فێر بکەی، کە خوا فێری کردوی؟

خدر گوتی: تۆ ناتوانی ئارامم لەگەڵدا بگری.

چونکە خوا جۆرە زانستێکی فێری من کردوە تۆ نایزانی.

جۆرە زانستێکیشی فێری تۆ کردوە من نایزانم.

موسا گوتی: بە یارمەتی خوا ئارام دەگرم و سەرپێچیت ناکەم.

ڕۆیشت تا گەیشتنە کەنار دەریا، هیچ کەشتیەکیان نەبو پێی بڕۆن، چاوەڕێ بون تا کەشتیەك هات، داوایان لێکردن هەڵیان بگرن، ئەوانیش خدریان ناسی بۆیە بەبێ کرێ هەڵیانگرتن.

چۆلەکەیەك هات لەسەرلێواری کەشتیەکە نیشت و یەك ـ دو دەنوکی لە دەریا دا.

خدر گوتی: ئەی موسا ئەو زانستەی من و تۆ هەمانە وەك ئەو دەنوکە ئاوەی ئەم چۆلەکە وایە لە چاو ئەم دەریایەدا.

پاشان خدر چو تەختەدارێکی لە کەشتیەکە دەرهێنا و فڕێی دا.

موسا گوتی: ئەمانە بەبێ کرێ هەڵیانگرتین کەچی تۆ کەشتیەکەیان کون دەکەی تا نقوم بن و بخنکێن؟!

خدر گوتی: ئەدی نەمگوت ناتوانی ئارامم لەگەڵ بگری؟!

موسا گوتی: لێم مەگرە لەبیرم کرد، کارەکەشم وا لێ بە زەحمەت مەکە.

لە جاری یەکەمدا موسا لەبیری کرد لێی نەپرسێ.

پاشان کە دابەزین ڕۆیشتن و بەلای منداڵێك تێپەڕین کە لەگەڵ منداڵان یاری دەکرد، خدر چو ملی منداڵەکەی گرت و سەری هەڵکێشا.

موسا گوتی: چۆن یەکێك دەکوژی بێئەوەی کەسێکی کوشتبێ؟!

خدر گوتی: ئەدی نەمگوت ناتوانی ئارامم لەگەڵ بگری؟!

پاشان ڕۆیشتن چونە گوندێك داوایان لە خەڵکی گوندەکە کرد خواردنیان بدەنێ، بەڵام خەڵکەکە میوانداریيان نەکردن.

گوندەکە دیوارێکی لێبو خەریکبو بڕوخێ، خدر چو بە دەستی خۆی

دیوارەکەی سەرلەنوێ بەڕاستی دروست کردەوە.

موسا گوتی: ئەگەر مەبەستت بوایە کرێت لەسەر وەردەگرت!

خدر گوتی: کەواتە لێرەوە دەبێ من و تۆ لە یەکتری جوێ بینەوە!

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (خوا ڕەحم بە موسا بکا، حەزمان دەکرد ئارامی بگرتایە تا زیاترمان لەبارەی خدر زانیبایە!).(١)

## ٤٥-لێکدانەوە

پاشان خدر هۆیەکانی بە موسا گوت.

پێیگوت: کەشتیەکە هی خەڵکێکی هەژار بو، کە لەناو دەریادا ئیشیان پێدەکرد، لەبەر ئەوە عەیبدارم کرد، چونکە پاشایەك لە دوایانەوە بو هەمو کەشتیەکی بێ عەیبی زەوت دەکرد.

منداڵەکەش دایك و باوکێکی بڕواداری هەبو، لەوە ترساین نەبادا دایك و باوکەکەی توشی بێبڕوایی بکا.

بۆیە ویستمان خوا کوڕێکی چاکتریان پێببەخشێ لەگەڵیان چاك بێ و توشی بێبڕواییان نەکات.

دیوارەکەش هی دو منداڵی هەتیوی گوندەکە بو، گەنجینەیەکی لەژێر دابو، باوکیان پیاوێکی چاکەکار بو، جا خوا ویستی کە منداڵەکان گەورە بون و پێڕاگەیشتن گەنجینەکەیان دەربێنن، ئەمەش وەك ڕەحمەتێك لە خواوە بۆیان.

ئەم کارانەشم کە کرد لە خۆڕا نەبو، بەڵکو خوا فەرمانی پێکردوم. جا ئەوەبو

---

(١) الجامع الصحيح للبخاري.

لێکدانەوە و هۆی کارەکانم کە تۆ نەتتوانی ئارامیان لەسەر بگری.

موسا لێرەدا بۆی ڕون بوەوە کە هیچ کەسێك ناتوانێ هەمو زانستێکی خوا بزانێ، زانی خوا بڕێ زانستی بە کەسانێك بەخشیوە و بڕێکیشی بە کەسانێکی تر، هەر زانایەکیش هەبێ لەویش زاناتر هەیە.

## ٤٦- نەوەی ئیسرائیل لە دوای موسادا

موسا کۆچی دوایی کرد، نەوەی ئیسرائیلیش هەر بە سەرگەردانی لەسەر زەوی دەگوزەران، ئەویش لەبەر ئەوەی کردەوەکانیان خراپ بو و خوا سزای دابون.

خوا ڕیسوایی و زەبونێتی لەسەر نوسین، چونکە ئەوان خوایان توڕە کرد.

خوایان توڕە کرد، ئەو خوایەی کە چەندین پێغەمبەر و پاشای لەناو پەیدا کردن و ئەو نیعمەتەی لەو سەردەمدا بەوانی بەخشی بە کەسی‌تری سەر زەوی نەبەخشی.

ئەو خوایەی کە لەژێر دەستی فیرعەونی ڕزگار کردن، کە فیرعەون منداڵەکانی دەکوشتن و ئافرەتەکانی دەکردنە خزمەتکار.

ئەو خوایەی کە دەریای بۆ شەق کردن و لە خنکان ڕزگاری کردن و فیرعەون و دەستوپێوەندەکەی نقوم کرد.

ئەو خوایەی کە بە هەور سێبەری لەسەر کردن و گەزۆ و شەلاقەی بۆ ناردن.

ئەو خوایەی کە لەزەویدا چەندین کانیاوی بۆ هەڵقوڵاندن و خواردن و خواردنەوەی بۆ زۆر کردن.

بەڵام ئەوان لە پای هەمو ئەو بەهرە و بەخششانەدا بڕوایـان بـە نیـشانەکانی خوا نەهێنا و سەرپێچی و دەستدرێژییان کرد.

پێغەمبەر موسایان تورە کرد کە بۆیان لە هەمو کەس بەسۆز و بـە بـەزەییتر بو، تەنانەت لە باب و دایکیشیان بە بەزەییتر بو.

ئـەو پێغەمبـەرەیان تـورە کـرد کـە بۆیـان وەك دایکێـك ــ کـە منداڵـە شیرخۆرەکەی لـێ بزربـێ ــ بـە پـەرۆش بـو، کـە بۆیـان وەك دایکێـك ــ کـە منداڵەکەی هەتیو بێ ـ بە پەرۆش بو.

ئەو پێغەمبەرەی کە ئەگەر جوێنیان پێدابوایە بۆیان لەخوا دەپاڕایـەوە، کـە ئەگەر گاڵتەیان پێ بکردایە و پێی پێکەنیبونایە بۆیان دەگریـا، کـە ئەگـەر بـە وشك و ڕەقی ڕەفتاریان لەگەڵ بکردایە دەیلاواندنەوە.[1]

ئەو پێغەمبەرەی کە لە کۆیلایەتی و ژێردەستی فیرعەون رزگاری کردن، کـە لە بەندیخانەی میسر قوتاری کردن و بردنیە خاکی ئـازاد و سـەربەرزی، کـە لـە ژیانی بەدبەختانەی کۆیلەییەوە بەرەو ژیانی گەردەنبەرزانەی سەربەستیی بردن.

کەچی ئەوان تورەیان کرد و ئازاریان دا و لامل بون و گاڵتـەیان پێکـرد و بـە سـوکترین کـەس سـەیریان کـرد، بـەڵام لـەلای خـوا لەوپـەڕی پایـە بـەزری و شکۆمەندی دابو.

توخوا نەتەوەیەك هێندە سپڵە و هیچ و پوچ و کەللەڕەق و بێبڕوا و دورلـەخوا بێ شایستەی ئەو سزایە نـین کـە تاهەتایـە لـە سەرشـۆڕی و لـە زەبـونی و لـە ڕیسوایی و لە سەرگەردانی دابن و ڕزگار نەبن؟

بەڵێ بێگومان شایستەن چونکە ئۆباڵی کردەوەکـانی خۆیـان هەڵدەگرنـەوە، خوا ستەمی لـێنەکردن بەڵکو خۆیان ستەمیان لەخۆ کردوە.

---

(١) لاواندنەوە: دەسبەسەرداهێنان، دڵدانەوە.

## ١- چاوخشاندنەوەیەك بە بەسەرهاتەكانی پێشودا

لەم لاپەڕانەی هەڵتاندانەوە بەسەرهاتی پێغەمبەر ئیبراهیم و پێغەمبەر یوسف و پێغەمبەر نوح و پێغەمبەر هود و پێغەمبەر صالح و پێغەمبەر موساشتان كەمێك بە درێژی خوێندەوە، بەسەرهاتەكانتان بە تاسە[1] و ڕێزلێنانێكی زۆرەوە خوێندەوە، دەرگای دڵ و دەرونتان بۆ كردنەوە، زەین[2] و عەقڵی ڕون كردنەوە، زار و زمانی پاراو كردن، خەڵك دەیدیتن بۆ برا بچوكەكانتان دەگێڕایەوە، بۆ دایك و باوك و برا گەورەكانتان دەگوتەوە، تام و چێژێكی زۆرتان وەردەگرت، حەزتان دەكرد هەمو دەمێ بیگێڕنەوە.

## ٢- بەسەرهاتی ململانێ لە نێوان ڕاستی و ناڕاستیدا

ئەم بەسەرهاتانە بەسەرهاتی شەیدائامێز و سەرنجڕاكێشن، بەسەرهاتی ململانێی نێوان ڕاستی و ناڕاستی، زانست و نەزانی، ڕوناكی و تاریكی، مرۆڤایەتی و دڕندەیی و، دڵنیایی و گومڕایین.

بەسەرهاتی سەركەوتنی ڕاستین بەسەر ناڕاستی، زانستن بەسەر نەزانی، بێهێز بەسەر بەهێز و، كەمی پاكن بەسەر زۆری ناپاكدا.

بەسەرهاتی پڕ لە زانست و دانایی و پەند و ئامۆژگارین، خوا ڕاستی فەرموە كە دەڵێ: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ مَا كَانَ حَدِيثًا

---

(١) تاسە: شەوق، حەزرەت.

(٢) زەین: بیروهۆش.

يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾[1].

بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرانەی کە بۆمان باسکردن هەمو ئەو بەسەرهاتانە نیە کە لە قورئاندا باسکراوە، بەڵکە بەسەرهاتی زۆری تر هەیە کە باسمان نەکردوە.

(١) سورەتی یوسف(١١١)

## ١- شوعەیب دەبێتە پێغەمبەری مەدیەن

خەڵکی مەدیەن خەڵکێکی بازرگان و کاسبکار بون، شارەکەیان لەسەر کەناری دەریای سور بو و دەکەوتە سەر ڕێگەی بازرگانی نێوان یەمەن و شام و نێوان عێراق و میسر.

ئەوانیش وەك نەتەوەکانی تری پێغەمبەران نەتەوەیەکی هاوبەشپەرست بون، وێڕای هاوبەشپەرستیەکەشیان تەرازوبازبون و فێڵیان لە پێوان و لە کێشان دەکرد، جەردەییان[1] دەکرد و ڕێیان لە کاروانان دەگرت، هەڕەشەیان لێدەکردن و چاویان لێ سور دەکردنەوە، بەدکاری و بەربەرەڵاییان بڵاو دەکردەوە، وەك ئەو دەوڵەمەندانە وابون کە بڕوایان بە لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی نەبو و لەسزای خوا نەدەترسان.

خوا پێغەمبەر شوعەیبی بۆ ناردن تا بۆ لای خوا بانگیان بکا و لە سزای خوایان بترسێنێ و پێیان بڵێ:

ئەی نەتەوەکەم! خوا بپەرستن، جگە لە خوا هیچ خواوەندێکی ترتان نیە، فێڵ لە تەرازو و لە پێوانە مەکەن، ئێوە دەوڵەمەندن و پێویستیتان بە تەرازوبازی نیە! من لە سزای ڕۆژێکی سەخت دەترسم توشتان ببێ، نەتەوەکەم! تەرازو و پێوانەکانتان بە ڕاستی و بەبێ فڕوفێڵ بکێشن و بپێون، دزی و گزی[2] تێدا مەکەن، بەدکاری بڵاومەکەنەوە و بەدکار مەبن.

---

(١) جەردەیی: ڕێگری.

(٢) گزی: خیانەت.

## ٢- بانگەوازی شوعەیب

شوعەیب بەردەوام ئامۆژگاری دەکردن و گرێی دڵی دەکردنەوە، کە بریتی بـو لە گرێی خۆشویستن و زیادکردنی پارەوپول و ماڵی دنیا، دەیگوت:

ئەو قازانجەی کە لە پێوانە و کێشانەی ڕاست دەستتان دەکـەوێ گـەلێك لـەو پارەوپولە باشترە کە بە زوڵم و گزی لە خەڵکی دەدزن، ئەگـەر تەماشـای ژیـانی خۆتان و ژیانی ئـەو کەسـانە بکـەن کـە دەوڵەمەنـدن و پـارەوپولێکی زۆریـان کۆکردۆتەوە ؛ دەبینن ئەوانەی کە بە گزی و دزی و تەرازوبازیەوە پەیدایان کردوە ئەوا یان پارەوپولەکەیان فەوتاوە یان دزراوە یان تالاّن کراوە یان لە ڕێگایەکی دژ بە ڕەزامەندی خوا بەکارهێنراوە یان یەکێك بوەتە خاوەنی و بە خەساری داوە.

کەمێکی سودبەخش لە زۆرێکی بێسود باشترە، پیس قەت وەکو پاك نیە، با فرەیی[1] پیسەکەش سەرمەستتان بکا!

من بۆتان دڵسۆزم و ئامۆژگاریەکەشم لـە بەرژەوەنـدی ئێوەیـە، خـوا خـۆی چاودێرتانە و ئاگای لە کردەوەتانە.

بە نەرم و نیانی و دانایی و زانایی و بەرچاوڕونیەوە دەیوت:

چاك بزانن پاداشتی لای خوا کە هەمیـشەییە و نابڕێتـەوە لـە هـەمو دنیـا باشترە ئەگەر بڕوادار بن، منیش چاودێر نیم بەسەرتانەوە.

---

(١) فرەیی: زۆری.

## ٣- باوکێکی میهرەبان و مامۆستایەکی دانا

شوعەیب وەك باوکێکی میهرەبان و وەك مامۆستایەکی دانا بە زۆر جۆر دەیدواندن و زۆر بە هونەر ئامۆژگاری دەکردن، دەیگوت:

نەتەوەکەم! خوا بپەرستن جگە لە خوا هیچ خواوەندێکیترتان نیە، وا بەڵگەتان بۆ هاتوە کە من پێغەمبەرم، جا بە قسەم بکەن، کێشان و پێوانتان بە تەواوی بێ و فێڵ و گزی تێدا مەکەن، دزی لە شمەکی[1] خەڵکی مەکەن.

لە زەویشدا دوای ئاوەدانکردنی خراپەکاری مەکەن ئەگەر ئێوە بڕوادارن.

لەسەر ڕێی بڕواداران مەوەستن و هەڕەشەیان لێمەکەن، ڕێی خوایان لێ تەنگ مەکەن، دینی خوا بە خواروخێچ و نادروست پیشان مەدەن، بیر لەوە بکەنەوە کە پێشتر چەند ناگزور و بێکەس بون، کەچی ئێستاکە وا زۆرن و دەوڵەمەندن، تەماشای سەرەنجامی بەدکارانی پێش خۆتان بکەن بزانن چیان بەسەر هاتوە؟

## ٤- وەڵامی نەتەوەکەی

دوای ئەوەی زیرەك و هۆشمەندەکان لە بانگەوازەکەی شوعەیب ورد بونەوە و وتەکانیان شیکردەوە، زۆر بە سەرگەردانی و لەخۆباییەوە وەك بڵێی رازێکیان دۆزیبێتەوە یان مەتەڵێکیان شیکردبێتەوە گوتیان:

ئەی شوعەیب! نوێژەکانت هانت دەدەن واز لە پەرستراوی باب و باپیرانمان بێنین، یان بەئارەزوی خۆمان دەستکاری دارایی خۆمان نەکەین؟! دیارە دیار پیاوێکی بەهۆش و زیرەکی!.

---

(١) شمەك: شتومەك.

## ٥- شوعەیب بانگەوازەکەی ڕون دەکاتەوە

شوعەیب هەر بە نەرمی دەیدواندن، لەگەڵیان توندوتیژ نەبو، لێیان تورە نەدەبو، بۆی ڕون دەکردنەوە کە بۆچی بە درێژایی ئەو هەمو ماوە دور و درێژەی پێشتر بانگەوازەکەی ڕانەگەیاندوە و ئامۆژگاری نەکردون هەرچەندە ئەوان هەر ئاوا بەدکار و بەدڕەوشتیش بون، بۆی ڕون دەکردنەوە لەبەرئەوە بوە چونکە ئێستاکە خوا سروشی بۆ ناردوە و کردویەتی بە پێغەمبەر.

بۆی ڕون دەکردنەوە لەبەر حەسودی نیە کە ئامۆژگارییان دەکا، چونکە خوا دەوڵەمەندی کردوە و رزقێکی پاك و حەلاڵی پێبەخشیوە، هەروەها بەم بانگەوازە ئاسودە و دڵخۆشە، سینە گوشاد و بێخەمە، بە زار و بە دڵیش سوپاسگوزاری خوایە.

بۆی ڕون دەکردنەوە کە ئەو پێیان دەڵێ ئەم کارە مەکەن خۆی ناچێ بیکا، کە پێیان دەڵێ ئەم کارە بکەن خۆشی دەیکا، چونکە لەو کەسانە نیە کە بە خەڵکی دەڵێن و خۆشیان نایکەن.

ئەو دەیەوێ خەڵکەکە ڕاستەڕێ و ئاسودە بن، لەو سزایە رزگار بن کە خەریکە یەخەیان بگرێ، هەڵبەت لە چاکەی خواوەیە کە ئەو دەتوانێ بەم کارە هەڵسێ، بۆ ئەوەی کارەکەشی سەربگرێ تەنها پشت بە خوا دەبەستێ.

شوعەیب بە نەتەوەکەی دەگوت:

نەتەوەکەم! بۆ بڕوام پێناکەن، ئاشکرایە بەڵگەم بۆ هێناون، لەبەر هیچیشم نیە چونکە وا خوا رزقێکی پاك و چاکی پێداوم، بە پێچەوانەی فەرمانەکانیشم ناجوڵێمەوە، دڵنیا بن من تەنها بۆ راستەڕێبونی ئێوەمە، ئەگەر دژایەتیشم بکەن من هەر بەردەوام دەبم و واز لە بانگەوازەکەم ناهێنم، چونکە من پشتم بە خوا قایمە و داوای یارمەتی لە خواوە دەکەم.

## ٦- باش تێناگەین چ دەڵێی!

نەتەوەکە خۆیان لە گێلی دەدا و وایـان نیـشان دەدا لـە وتـەکانی شـوعەیب ناگەن، وەك بڵێی بە زمانێکی بێگانە قسەیان لەگەڵ بکا! کەچی شوعەیب کوڕی ئەو وڵاتە بو و لە هەمان نەتـەوە بـو، وەك بڵێـی قـسەکانی ڕون و ڕەوان نـەبێ! کەچی زمانی شوعەیب لە زمانی هەمویان ڕون و ڕەوانتر بو، واتای وتەکانی لـە وتەکانی هەمویان ئاشکراتر بو.

بەڵام خەڵك ئەگـەر ئامۆژگـاری وەرنـەگرن و کاریـان لەبـەر زەحمـەت بـێ و نەیانەوێ لەڕاستی بگەن بەم جۆرە خۆیان لە گێلی دەدەن.

## ٧- شوعەیب سەرسامی لە نەتەوەکەی دەردەبڕێ

نەتەوەکە شوعەیبیان بە تەنیا و بێ پشت و پەنا دەزانی، ئەگەر لەبەر هـۆز و خزمایەتی نەبوایە بەردبارانیان دەکرد و دەیانکوشت.

بەڵام شوعەیب سەرسامی لەمە دەردەبڕی کە ئەوان لـە خـوا ناترسـن، ئـەو خوایەی کە بە دەسەڵات و بە هێزە و لەسەر هەمو شتێك بە توانایە، کەچـی لـە هۆزەکەی دەترسن کە ڕەنگە توشی نەخۆشی و بێهێـزی و کەنـەفتی[1] بـبن یـان ڕەنگە هەر لەناوبچن.

نەتەوەکە دەیانگوت:

ئەی شوعەیب ئێمە زۆر لە قسەکانت تێناگەین، پێمانوایە تۆ کەسـێکی بـە تەنیا و بێ پشت و پەنای، خۆ ئەگەر لەبەر خاتری هۆزەکەت نەبێ بەرد بارانمـان

---

(١) کەنەفتی: پەککەوتەیی.

دەکردی و لەکۆڵمان دەکردیەوە، هیچیشت پێنەدەکرا.

شوعەیب وەڵامی دانەوە و گوتی:

نەتەوەکەم! پێتان وایە هۆزی من لەو خوایە بە هێزترە کە ئێوە ڕوتان لێ وەرگێڕاوە و ناپەرستن؟!، چاك بزانن خوای من بە هەمو کردەوەیەکتان ئاگادارە.

## ٨- دواهەمین تیر

نەتەوەکە کە بیانویان بڕا و قسەیان پێنەما ئەوجا دواهەمین تیریان هاویشت، کە بێبڕوا لوتبەرزەکانی گشت نەتەوەیەك بەرامبەر بە پێغەمبەر و شوێنکەوتوانی هاوێشتویانە.

ئەو پیاوماقوڵانەی کە بڕوایان نەهێنابو گوتیان:

ئەی شوعەیب گوێ بگرە ئەگەر نەگەڕێنەوە سەر ڕێبازەکەمان ئەوا خۆت و بڕوادارە شوێنکەوتوەکانت لە شاری دەردەکەین.

## ٩- بیانوێکی قسەبڕ

شوعەیب وەڵامێکی پڕ لە شانازی و غیرەتی دانەوە، شانازی بە ئاینەکەی، غیرەت بۆ بیروبڕوا و ویژدانەکەی...

گوتی: ئەی ئەگەر حەزن نەکەین هەڵگەڕێینەوە.

ئێمە دوای ئەوەی کە خوا لە ڕێبازەکەی ئێوە رزگاری کردین ناگەڕێینەوە سەری و خوا ڕێگەمان پێنادا، چونکە ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ڕێبازەکەتان واتا

بوختانێکی گەورەمان بە خوا هەڵبەستوە جا مەحاڵە لە دین هەڵگەڕێینەوە.

بشزانن کە خوا ئاگای لە گشت شتێ هەیە، ئێمە پشتمان بە خوا بەستوە.

خوایە! یەکلامان بکەوە، با یەخەمان لە یەخەی ئەو نەتەوە بێبڕوایە ببێتەوە.

## ١٠- هەمان قسەی بێبڕواکانی پێشانیان کردەوە

وتەکانی شوعەیب دادی نەدان[1] و هەمان قسەی بێبڕواکانی پێشانیان کردەوە و گوتیان:

ئەی شوعەیب! دیارە تۆ جادوت لێکراوە، تۆش وەکو ئێمە مرۆڤی و بڕوات پێناکەین پێغەمبەر بی، ئەگەر ڕاست دەکەی پێغەمبەری چەند پارچەیەکی ئاسمانمان بەسەر داباریێنە.

## ١١- سزای نەتەوەیەك کە بڕوای بە پێغەمبەرەکەی نەهێنابێ

هەر نەتەوەیەك بڕوای بە پێغەمبەرەکەی نەهێنابێ و سوپاسی بەخشەکانی خوای نەکردبێ سزاکەی هەمان شتە، دەبێ لەناوبچن.

خوا بومەلەرزەیەکی گەورەی توشی نەتەوەکە کرد و هەموی کوشتن، دیمەنێك بون دەتگوت قەت خۆشی و بەخششیان لە ژین نەدیوە.

بەڵێ، ئەوانەی کە بڕوایان بە شوعەیب نەهێنا هەمو لەناو چون.

---

(١) دادی نەدان: سودی پێ نەگەیاندن.

## ١٢- پەیامی ڕاگەیاند و ڕاسپاردەی بەجێگەیاند

شوعەیبیش وەکو هەمو پێغەمبەرەکانی تر پەیامی خوای ڕاگەیاند و ڕاسپاردەی[1] بەجێگەیاند و بروبیانوی خەڵکی بڕی.

دوای ئەوەی کە بێبڕواکان سزای خوایان توش بو و مردن؛ شوعەیب ڕوی تێکردن و پێیگوتن:

خەڵکینە! من پەیامی خوام پێڕاگەیاندن و ئامۆژگاریم کردن بەڵام ئێوە هەر لەسەر بێبڕوایی مانەوە جا من چۆن ئاخ و ئەفسوس[2] بۆ نەتەوەی بێبڕوا هەڵدەکێشم؟!

---

(١) ڕاسپاردە: ئەمانەت.

(٢) ئەفسوس: داخ و خەم.

بەسەرهاتی

# پێغەمبەر داود
# و
# پێغەمبەر سلێمان

سڵاوی خوایان لێبێ

## ١- قورئان لەبارەی نیعمەتەکانی خواوە دەدوێ

قورئان تەنها باسی ئەوە ناکات کە پێغەمبەران چۆن لە لایەن نەتەوەکانیەوە گاڵتە و سوکییان پێکراوە و درۆی گەورە گەورەیان پێهەڵبەستراوە و لە شار و وڵات دەرکراون، کە نەتەوەکانیش لەبەرئەوەی بڕوایان نەهێناوە و لاقرتێیان پێکردون و پلان و نەخشەیان بۆ کوشتنیان کێشاوە: خوا دوچاری سزا و ئەشکەنجەی کردون و لە ناوی بردون.

قورئان جگە لەم بابەتانە کە لە بەسەرهاتەکانی پێشودا لە بارەیان دواوە باسی نیعمەتەکانی خواش دەکا، هەندێ جار بە درێژی و هەندێ جاریش بە کورتی باسیان دەکا، باسی گەلێ لەو نیعمەتانە دەکا کە بە پێغەمبەرانی بەخشیوە وەکو پێغەمبەر داود، پێغەمبەر سلێمان، پێغەمبەر ئەیوب، پێغەمبەر یونس، پێغەمبەر زەکەریا، پێغەمبەر یەحیا.

خوا پێغەمبەر داود و پێغەمبەر سلێمانی لەسەر زەوی باڵادەست کردبو، پاشایەتیەکی فرەوانی پێبەخشیبون، زانستێکی فرەی پێدابون، گەلێك شتی وای فێر کردبون کە خەڵك نەیاندەزانی، گیانلەبەر و بێگیانی بەهێز و سەرسەختی بۆ ڕام[1] کردبون.

خوا لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ عِلْمًا ۖ وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥﴾ وَوَرِثَ سُلَيْمَـٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَـٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ﴾[2] واتە:

(١) سەرسەخت: سەرکێش. ڕام: دەستەمۆ.

(٢) سورەتی النمل: (١٥- ١٦).

ئێمە زانستمان بە داود و بە سولەیمان بەخشیبو، ئەوانیش لە پای ئەمەدا گوتیان: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە ئێمەی لەناو زۆربەی بەندە بڕوادارەکانی بە باشتر هەڵبژرادوە. سولەیمان زانستەکەی لە داود بە میرات هەڵگرتەوە و گوتی: ئەی خەڵکینە! خوا ئێمەی فێری زمانی باڵندان کردوەو هەمو شتێکی پێبەخشیوین، بەڕاستی خوا چاکەیەکی گەورەی لەگەڵ کردوین﴾.

## ٢- نیعمەتی خوا بۆ داود

خوای گەورە شاخ و باڵندەی بۆ داود دەستەمۆ کردبو، کە دەپاڕایەوە و پاکیگاری[1] خوای دەکرد، ئەوانیش لە دویان دەگوتەوە، هەروەها فێری دروستکردنی زرێی کردبو، ئاسنیشی بۆ نەرم کردبو.

خوا لە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا ۖ يَـٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعْمَلْ سَـٰبِغَـٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ ۖ وَٱعْمَلُوا۟ صَـٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾.[2] واتە: ئێمە زێدەبەشێکمان بە داود بەخشیبو، فەرمانمان بە شاخ و بە باڵندان کردبو پاکیگاریەکانی لەگەڵدا بڵێنەوە و ئاسنیشمان بۆ نەرم کردبو. بە داودمان گوت: زرێی دامەن[3] شۆڕ دروست بکە و با ئاڵقەچنینەکانیشی بەئەندازە و لەڕیزیەك و تێکهەڵکێش بن. خانەوادەی داود! دە ئێوەش لە پای ئەمەدا کردەوەی سوپاسگوزاران بکەن، چونکە من کردەوەکانتان دەبینم﴾.

---

(١) پاکیگاری: گوتنی سبحان الله.
(٢) السبأ: (١٠-١١).
(٣) دامەن: داوێن، دامێن.

هــــەروەها دەفــــەرموێ: ﴿وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ ۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾ وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ ۖ فَهَلْ أَنتُمْ شَٰكِرُونَ﴾[1] واتە: شاخ و باڵندەمان بۆ داود دەستەمۆ کردبو، پاکیگارییان لەگەڵدا دەگوتەوە، ئێمە توانامان بەسەر شتی لەم چەشـنە هەیـە. فێری پیشەی دروستکردنی زرێمان کرد تا بتوانن خۆ لە دوژمـن بپـارێزن، ئایـا سوپاسی خوا ناکەن؟!..﴾.

## ٣- سوپاسی داود لەسەر نیعمەتەکان

داود لەگەڵ ئەم هەمو مولکە زۆر و زەوەندەدا، لەگەڵ ئەوەی کە دەسـترەنگین و بەهێز بو، بەندەیەکی لەخواترس و ژیوان[2] بو، هەردەم یادی خـوای دەکـرد و دەپاڕایەوە، فەرمانڕەوایەکی دادپەروەر بو، حوکمێکی دادگەرانەی بـۆ خـەڵکی دەکردو لە ڕێی ڕەوا لای نەدەدا.

خوا لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ﴾[3] واتە: ئەی داود! ئێمە تۆمان لەسەر زەوی کردۆتە جێنشین، بە دادگەری حوکم لە نێوان خەڵکیدا بکە، وەدوای هەوا و هەوەست نەکەوی چونکە لە ڕێی خوا گومڕات دەکا، ئەوانەی لە ڕێی خوا گومڕا بونە، لە ڕۆژی دوایی سزایەکی سەختیان هەیە﴾.

---

(١) الأنبياء: (٧٩-٨٠).

(٢) ژیوان: پەشیمان، گەڕانەوە بۆ لای خوا.

(٣) سورەتی ص: (٢٦).

## ٤- نیعمەتی خوا بۆ سولەیمان

خوای گەورە (با)ی بۆ سولەیمان دەستەمۆ کردبو، هەر جێگایەکی مەبەست بوایە (با) بۆ ئەویی هەڵدەگرت و بە خێراییەکی زۆر و بە کەمترین کات دەیگواستەوە، هەروەها جنۆکەی زیرەك و بەهێزیشی بۆ دەستەمۆ کردبو کە فەرمانەکانیان جێبەجێ دەکرد و پرۆژە گەورەکانی ئاوەدانکردنەوە و بیناسازییان بۆ تەواو دەکرد.

خوا لە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا ۚ وَكُنَّا بِكُلِّ شَىْءٍ عَٰلِمِينَ ﴿٨١﴾ وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعْمَلُونَ عَمَلًا دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَكُنَّا لَهُمْ حَٰفِظِينَ ﴿٨٢﴾﴾[1] واتە: (با)ی بەهێزمان بۆ سولەیمان دەستەمۆ کردبو، سولەیمانی بۆ شام (ئەو ئەرزەی کە بەرەکەتمان پێداوە) هەڵدەگرت کە شوێنی نیشتەجێبونی خۆی بو، ئێمە بە هەمو شتێك ئاگادارین. هەروەها ئێمە گەلێك شەیتانیشمان بۆ دەستەمۆ کردبو کە دەچونە بنی دەریا دوڕڕ و گەوهەریان بۆ دەردێنا و گەلێ کاری تریشیان بۆ دەکرد وەکو دروستکردنی شار و بالاخانە﴾.

خوای گەورە لە شوێنێکی تری قورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ۖ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ۖ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَٰتٍ ۚ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ

(١) الأنبياء: (٨١-٨٣)

دَاوُۥدَ شُكۡرًاۚ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴾ . [١] واتە: (با)مان بۆ سولەیمان دەستەمۆ کردبو، کە بە ماوەی یەك دانی بەیانی دوری مانگەڕێیەکی دەبڕی، بە ماوەی دانی ئێوارانیش دوری مانگەڕێیەکی دەبڕی، هەروەها کانی مسمان بۆ لە زەوی هەڵقوڵاند، گەلێك جنۆکەشمان بۆ دەستەمۆ کردبو، کە بە فەرمانی خوا کاریان بۆ دەکرد، هەر جنۆکەیەك ئەگەر لە فەرمانی ئێمە لایدا بوایە توشی ئەشکەنجەی ئاگرێکی بە بڵێسەمان دەکرد، سولەیمان هەر جۆرە کۆشك و پەیکەرێك و هەر خوانێکی گەورەی وەك حەوز و هەر جۆرە مەنجەڵێکی گەورەی مەحکەمی بویستبایە بۆیان دروست دەکرد. بە خانەوادەی داودمان گوت: لە پای ئەم هەمو نیعمەتەدا سوپاسی خوا بکەن، کەسانێکی کەم هەنە سوپاسی خوا بکەن﴾.

## ٥- تێگەیشتنێکی ورد و زانستێکی قوڵ

سولەیمان لە کێشەکەیدا کە بۆ لای داودی باوکی بەرز کرایەوە زیرەکایەتی و توانستە فەرمانڕەواتیەکەی وەدەردەکەوێ، کێشەکەش[٢] بەمجۆرە بو:

پیاوێك ڕەزێکی هەبو تازە هێشوی کرد بو، مەڕ و ماڵاتی کابرایەکی دەچێتە ناوی و ڕەزەکەی لـێ وێران دەکەن و هەمو بەرەکەی لـێ دەخۆن.

پێغەمبەر داود حوکم دەدا کە مـەڕ و ماڵاتەکـە بدرێتـە خـاوەن ڕەزەکـە و کێشەکە کۆتایی بێ.

بەڵام سولەیمان گوتی: ئەی پێغەمبەری خـوا ڕێگەچـارەیەگی تـریش هەیـە، گوتی: چیە؟

---

(١) سورەتی سبأ(١٢-١٣)

(٢) کێشـە: ناکۆکیەك، قضية.

گوتی: رەزەکە بدەیە خاوەنی مەڕو ماڵاتەکە خزمەتی بکا تا وەکو خۆی لێ دێتەوە، مەڕ و ماڵاتەکەش بدەیە خاوەنی ڕەزەکە شیریان بدۆشێ و خوریيان ببڕێ و کەڵکیان لێ وەرگرێ، جا کە ڕەزەکە پێگەیشتەوە ڕەز و مەڕوماڵاتەکە تەسلیم بە یەکتر بکەنەوە.

خوای گەورە تێگەیشتنێکی ورد و زانستێکی قوڵی بە سولەیمان بەخشیبو، لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَدَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ إِذۡ يَحۡكُمَانِ فِي ٱلۡحَرۡثِ إِذۡ نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ ٱلۡقَوۡمِ وَكُنَّا لِحُكۡمِهِمۡ شَٰهِدِينَ ٧٨ فَفَهَّمۡنَٰهَا سُلَيۡمَٰنَۚ وَكُلًّا ءَاتَيۡنَا حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ﴾.[1]

## ٦- سولەیمان زمانی باڵندە و گیانلەبەران دەزانێ

قورئانی پیرۆز بەسەرهاتێکی پڕ حیکمەت و بە تام و چێژی بۆ باس کردوین، ئەوە دەردەخا کە پێغەمبەر سولەیمان پیاوێکی بەهۆش و گۆش و زیرەك بوە، کاروباری وڵاتەکەی بە ڕێکوپێکی بەڕێوە بردوە، دەسەڵاتێکی مەزن و بە زەبروزەنگی هەبوە، خوای گەورە خۆشی دنیا و ئاخیرەتی پێبەخشیوە، دەسەڵات و پاشایەتی و پەیام و پێغەمبەرایەتی بە باڵادا بڕیوە، زمانی باڵندە و گیانلەبەرانی زانیوە.

جارێکیان لەشکرەکەی کۆ دەکاتەوە کە لە جنۆکە و مرۆڤ و باڵندان پێکهاتبو، فەرمانیان پێدەکا چەك و رەختەی خۆیان ببەستن و بە ڕیز ڕیز و پۆل پۆلی ڕێکوپێك بوەستن و لە فەرمانی سەرکردەکانیان دەرنەچن، پاشان سولەیمان لە پێشەوەی هەمویان و ئەوانیش لە دواوەی بەڕێکەوتن و ڕۆیشتن.

---

(١) الأنبياء: (٧٨).

ڕێیان کەوتە ناو دۆڵی مێرولان، مێرولەیەك لەوە ترسا مێرولەکان بکەونە ژێر سمی ئەسپ و وڵاخەکانەوە بێئەوەی سولەیمان و لەشکرەکەی ئاگایان لێبێ، بۆیە فەرمانی بە مێرولەکان کرد بچنەوە ناو شارەکەیان.

سولەیمان لە قسەی مێرولەکە گەیشت، بەڵام لاف و گەزافی لێنەدا و بە پێغەمبەرایەتیەکەی لەخۆبایی نەبو، بەڵکو بەهۆی ئەم ڕوداوەوە پتر سوپاس و ستایشی خوای کرد، زیاتر لە خوا پاڕایەوە تا بۆ کاری چاك یارمەتی بدات و هەر لە ڕیزی پیاوچاکان بێت.

## ٨- بەسەرهاتی پەپوسلێمانە

پەپوسلێمانە بەڵەد[1] و چاوساغی پێغەمبەر سولەیمان بو، شوێنێ ئاوی لێبوایە و بۆ لەشکریش بگونجایە دەیدۆزیەوە.

جارێکیان سولەیمان بانگی کرد بێتە لای بەڵام پەپوسلێمانە دیار نەبو، سولەیمان توڕە بو و هەڕەشەی لێکرد.

دوای ماوەیەکی کەم گەڕایەوە و هاتەوە لای سولەیمان و گوتی:

شتێکم بینیوە نە تۆ نە لەشکرەکەت نەتاندیوە، هەواڵێکی ڕاستم لەبارەی ئاوایی (سەبەء)و شاژنەکەیەوە بۆ هێناوی:

موڵکێکی مەزن و وڵاتێکی پانوپۆڕیان هەیە، هەرچەندە نەتەوەیەکی ژیر و خاوەن هۆش و خاوەن سەرکردە و پاشایەتین بەڵام هەرزە و نەفامیشن!، سوژدە بۆ(ڕۆژ) دەبەن نەك بۆ خوا! نازانن ئەمە خوا نیە! نازانن خوا بپەرستن!

---

(١) بەڵەد: شارەزا.

## ٩- سولەیمان بانگی شاژنی سەبەو دەکات تا بێتە سەر دینەکەی

پێغەمبەر سولەیمان زۆری لەسەر دڵ گران بو کە پاشا و نەتەوەیەکی دراوسێ بێ کەچی نەیانناسێ و بانگەوازیان پێنەگەیشتبێ و هێشتا (ڕۆژ) بپەرستن.

پێغەمبەر سولەیمان کەفوکوڵی ئاین ئامێزی پێغەمبەرانەی لە دڵدا هەڵبو، وای بە باش زانی بەر لەوەی لەشکری بنێرێتە سەر نامەیەك بۆ شاژنی هاوبەشپەرست بنێرێ و بانگی بکا موسڵمان بێ و ملکەچی خوای میهرەبان بێ.

نامەیەکی بە کاریگەری بۆ نوسی، تێیدا داوای لێدەکرد بێتە سەر ئیسلام و موسڵمان بێ.

نامەکە نەرم و نیانی و توندوتیژی بێ لاف و گەزافی پێغەمبەران و غیرەت و مەردایەتی پاشایانی بەیەکەوە کۆکردبۆوە.

سولەیمان هەردو سیفەتی تێدابو.

## ١٠- شاژن ڕاوێژ بە کاربەدەستانی وڵاتەکەی دەکا

ئەو ژنەی کە وڵاتەکەی بەڕێوە دەبرد ژنێکی ژیر و تێگەیشتو بو، زو بڕیاری نەدەدا، شارەزاییەکی زۆری لەبارەی بارودۆخ و رابردوی پاشا و داگیرکەران هەبو، بەڵام عەقڵەکەی بە هەڵەی بردبو و خوای نەدەناسی و ڕۆژی بە خوا تێگەیی بو.

شاژن فیز و دەماری پاشایانە نەیگرت و ڕای خۆی لەم کێشەیە نەسەپاند، بەڵکو راوێژکار و ڕاگرانی وڵاتەکەی کۆکردەوە و پێیگوتن: ئەم نامەیەم لە لایەن پێغەمبەرێکەوە بۆ هاتوە کە گەورەترین پاشای ئەم سەردەمەیە، نامەکە وەکو نامەی تر نیە.

ڕاوێژکار و ڕاگرەکان ـ سای گشت دەستوپێوەندانی پاشایان خۆیان بە دڵسۆز دەردەخەن تا لە لای پاشا بەڕێز و خۆشەویست بن ـ گوتیان: ئێمە بە هێزین و لەشکرێکی گەورە و گرانمان هەیە و بەرەنگاری[1] دەبینەوە.

بەڵام شاژن ڕاکەیانی پێباش نەبو و پێیگوتن: ئەگەر بەرەنگار بینەوە ئەنجامێکی خراپی لێدەکەوێتەوە، بۆی باس کردن کە پاشا داگیرکەرەکان هەڵوێستیان چۆنە و چ دەکەن ئەگەر پێ بنێنە وڵاتێك، وڵاتەکەش کە ژێر دەکەوێ و دەدۆڕێنێ چۆن کاول و وێران دەبێ.

پێیگوتن ئەگەر بەرەنگاریان بینەوە و وەڵامی نامەکەیان نەدەینەوە وڵات و نەتەوەکەی ئێمەش ئاوەها کاول دەبێ.

پێیگوتن: من دیارییەکی زۆر نایاب و ناوازە[2] بۆ سولەیمان دەنێرم، بەم دیارییە تاقی دەکەمەوە، ئەگەر وەریگرت دیارە پاشایەکی داگیرکەرە ئەو کات ئێمەش بەرەنگاری دەبینەوە، بەڵام ئەگەر وەرینەگرت دیارە پاشایەکی پێغەمبەرە ئەو کات ئێمەش بڕوای پێدێنین و شوێنی دەکەوین.

## ١١- دیاریی دڵڕازیکردن

شاژن دیاریەکی گەورە و شایەن بە پاشایانی بۆ ڕەوان کرد.

کە دیاریبەران گەیشتنە لای سولەیمان، سولەیمان دیاریەکەی وەرنەگرت و گوتی: دەتانەوێ بەم دیاریە ڕازیم بکەن و وازتان لێبێنم لەسەر هاوبەشپەرستی و پاشایەتی خۆتان بمێننەوە؟!، خوا موڵك و ماڵ و لەشکرێکی زۆر چاکتری لە

---

(١) بەرەنگاربونەوە: ڕوبەڕوبونەوە.

(٢) ناوازە: دەگمەن.

ئێوە پێبەخشیوم، بزانن داواکەم داوایەکی ڕاستینەیە[1] و گاڵتە نیە، مەسەلەکە مەسەلەی بانگەواز و شوێنکەوتنە، مەسەلەکە دڵڕازیکردن نیە، ئەگەر وەڵامیشم نەدەنەوە بە لەشکرێکی گەورەوە دێمە سەرتان.

## ١٢- شاژن بە گەردەنکەچیەوە دێتە لای سولەیمان

دیارییەران کە دیارییەکەیان بۆ سولەیمان بردبو گەڕانەوە لای شاژنی سەبەو و باسوخواسەکەیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش بۆی ڕون بوەوە کە سولەیمان ڕاست دەکا پێغەمبەری خوایە، بۆیە بەخۆی و بە نەتەوەکەی ملکەچی فەرمانەکەی بون، بەگەردەنکەچیەوە لەگەڵ لەشکرەکەی بەرەو لای سولەیمان بەڕێکەوتن.

سولەیمان(سلاوی خوای لێبێ) زانی وەڵامی نامەکەیان داوەتەوە و بە گەردەنکەچیەوە دێنە لای، بەمە زۆر دڵخۆش بو و سوپاسی خوای کرد.

سولەیمان ویستی موعجیزەیەکی خوایی بە شاژن نیشان بدا تا بزانێ توانای خوا چەند گەورەیە و چ نیعمەتێکیشی لەگەڵ سولەیمان کردوە، ویستی بەر لەوەی بگەنە خزمەتی قەڵای شاژن بێنێتە لای خۆی، داوای لە دەست و پێوەندەکەی کرد قەڵاکەی بۆ بێنن. ئەوانیش لە ماوەیەکی زۆر کەم قەڵاکەیان هێنا.

سولەیمان فەرمانی کرد چەند ئاکارێکی[2] قەڵاکە بگۆڕن بۆ ئەوەی ڕاددەی ناسینەوەی شاژن تاقی بکاتەوە، جا ئەگەر شاژن نەیناسیەوە ئەوا دەبێتە بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی کە مەودای تێگەیشتنی کورتە و شتی وردتر و شاراوەتر هەیە عەقلی پێیان ناشکێ.

---

(١) ڕاستینە: بەجددی.

(٢) ئاکار: سیفەت.

## ١٣- کۆشکێکی شوشەیی گەورە

سولەیمان فەرمانی بە جنۆکە و مرۆڤە بیناسازەکان کرد، ئەوانیش کۆشکێکی شوشەیی زۆر گەورەیان بۆ دروست کرد، وایانکرد ئاوی بە ژێردا بڕوات، ئەگەر یەکێك لە کۆشکەکە شارەزا نەبوایە وایدەزانی ئاوە و شوشە جیای ناکاتەوە، بێگومان شاژنیش کە ببینێ وا تێدەگا ئاوە و قاچی خۆی هەڵدەکا، ئا لێرەدا کە بە هەڵەدا دەچێ کەموکورتی تێگەیشتنەکەی خۆی بۆ ڕون دەبێتەوە و دەزانێ بە ڕواڵەت خەڵەتاوە.

شاژن خۆی و نەتەوەکەی لەبەرئەوە سوژدەیان بۆ ڕۆژ دەبرد چونکە پێیان وابو ڕۆژ گەورەترین دیمەنی ڕوناکی و ژیانە، کە ئەم دوانەش سیفەتی خودانە. جا ئەو کاتەی دەگاتە جێ و بە هەڵەدا دەچێ، ئیتر بۆی ڕون دەبێتەوە کە شوشەکە بەئاو تێگەییوە بۆیە قاچی هەڵکردوە، بە هەمان شێوەش بۆی ڕون دەبێتەوە کە لەوەش بە هەڵەدا چوە کە ڕۆژ بە خوا تێگەییوە و سوژدەی بۆ بردوە و پەرستویەتی. هەڵبەت کارێکی وا لە سەدان وتار و لە هەزاران بەڵگەش بەهێزترە.

## ١٤- منیش لەگەڵ سولەیمان بۆ پەروەردگاری بونەوەر ملکەچ دەبم

هەر واش ڕوی دا، شاژن هەرچەندە ژنێکی زیرەك و بلیمەت بو بەڵام دوچاری ئەم هەڵە گەورەیە بو، هەر وایزانی ئاوێکی ڕون و ڕەوانی بەشەپۆڵە و جامی شوشەی لەسەر نیە، بۆیە قاچی خۆی هەڵکرد و ویستی پێبخاتە ناوی.

لێرەدا پێغەمبەر سولەیمان هەڵەکەی بۆ ڕاست کردەوە و پێی گوت: ئەم کۆشکە هەموی لە شوشەی بێگەرد دروستکراوە.

بەمجۆرە شاژن تانەی سەرچاوانی لاکەوت و بۆی ڕون بۆوە کە ئەو تا ئێستا ڕۆژی پەرستوە و سوژدەی بۆ بردوە بە هەڵەدا چوە و بە ڕواڵەت[1] خەڵەتاوە، بۆیە یەکسەر پەشیمان بۆوە و گوتی:

خوایە من تا ئێستا ستەمم لە خۆ کردوە کە هاوبەشم پەرستوە، ئێستاکەش ژیوانم و لەگەڵ سولەیمان ملکەچی تۆ دەبین و تەنیا تۆ دەپەرستم.

## ١٥- قورئان بەسەرهاتەکەی سولەیمان و شاژن دەگێڕێتەوە

بفەرمون ئەم بەسەرهاتە سەرنجڕاکێش و بە تام و چێژە لە قورئان بخوێننەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِيَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢١﴾ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾ إِنِّي وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسْجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٦﴾ قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ ٱذْهَب بِّكِتَٰبِي هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَٱنظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُاْ إِنِّيٓ أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَٰبٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَٰنَ

---

(١) ڕواڵەت: دیمەنی دەرەوەی شت.

وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتۡ
يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ تَشۡهَدُونِ ﴿٣٢﴾ قَالُواْ نَحۡنُ
أُوْلُواْ قُوَّةٖ وَأُوْلُواْ بَأۡسٖ شَدِيدٖ وَٱلۡأَمۡرُ إِلَيۡكِ فَٱنظُرِي مَاذَا تَأۡمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتۡ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا
دَخَلُواْ قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۚ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٤﴾ وَإِنِّي
مُرۡسِلَةٌ إِلَيۡهِم بِهَدِيَّةٖ فَنَاظِرَةُۢ بِمَ يَرۡجِعُ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ سُلَيۡمَٰنَ قَالَ
أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٖ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيۡرٞ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُمۚ بَلۡ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمۡ تَفۡرَحُونَ ﴿٣٦﴾
ٱرۡجِعۡ إِلَيۡهِمۡ فَلَنَأۡتِيَنَّهُم بِجُنُودٖ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخۡرِجَنَّهُم مِّنۡهَآ أَذِلَّةٗ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ﴿٣٧﴾ قَالَ
يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَيُّكُمۡ يَأۡتِينِي بِعَرۡشِهَا قَبۡلَ أَن يَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ عِفۡرِيتٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ أَنَا۠
ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَۖ وَإِنِّي عَلَيۡهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٞ ﴿٣٩﴾ قَالَ ٱلَّذِي عِندَهُۥ عِلۡمٞ مِّنَ
ٱلۡكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن يَرۡتَدَّ إِلَيۡكَ طَرۡفُكَۚ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسۡتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَٰذَا مِن
فَضۡلِ رَبِّي لِيَبۡلُوَنِيٓ ءَأَشۡكُرُ أَمۡ أَكۡفُرُۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشۡكُرُ لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي
غَنِيّٞ كَرِيمٞ ﴿٤٠﴾ قَالَ نَكِّرُواْ لَهَا عَرۡشَهَا نَنظُرۡ أَتَهۡتَدِيٓ أَمۡ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهۡتَدُونَ ﴿٤١﴾
فَلَمَّا جَآءَتۡ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرۡشُكِۖ قَالَتۡ كَأَنَّهُۥ هُوَۚ وَأُوتِينَا ٱلۡعِلۡمَ مِن قَبۡلِهَا وَكُنَّا مُسۡلِمِينَ ﴿٤٢﴾
وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعۡبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ إِنَّهَا كَانَتۡ مِن قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ ﴿٤٣﴾ قِيلَ لَهَا ٱدۡخُلِي ٱلصَّرۡحَۖ
فَلَمَّا رَأَتۡهُ حَسِبَتۡهُ لُجَّةٗ وَكَشَفَتۡ عَن سَاقَيۡهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ صَرۡحٞ مُّمَرَّدٞ مِّن قَوَارِيرَۗ
قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي وَأَسۡلَمۡتُ مَعَ سُلَيۡمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾[1]

(١) النّمل: (٢٠-٤٤).

## ١٦- سولەیمان بێبڕوایی نەکردوە، بەڵکو شەیتانەکان بێبڕواییان کردوە

جولەکەکان بوختانێکی وایان بە پێغەمبەر سولەیمان هەڵبەستاوە تەنانەت لە بڕوادارێك ناوەشێتەوە کە خوا دڵی بۆ بڕوا کردبێتەوە، نەخوازەڵا[1] پێغەمبەرێك کە خوا حیکمەت و پێغەمبەرایەتی و جێنشینایەتی پێبەخشی بێ!

دەڵێن: پێغەمبەر سولەیمان بە هۆی خێزانەکانیەوە جادو و بێبڕوایی کردوە و توشی هاوبەشپەرستی بوە و لەکاری یاکخواناسیدا ڕاست و چەوتی تێکەڵ کردوە.

بەڵام خوای گەورە ئەو تۆمەتانەی لەسەر لادەدا و دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ كَفَرُواْ[2] واتە: سولەیمان بێبڕوایی نەکرد بەڵام شەیتانەکان بێبڕواییان کرد و خەڵکیان فێری جادو دەکرد﴾.

﴿وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ ۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ فويل[3] واتە: سولەیمانمان بە داود بەخشی، کە بەڕاستی بەندەیەکی چاك و ژیوان بو﴾.

﴿فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ ۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ إِنَّا[4] واتە: سولەیمان لە لای ئێمەدا نزیکە و پلەیەکی چاکی هەیە﴾.

---

(١) نەخوازەڵا: خوانەخواستە، نەخاسمە.

(٢) سورەتی البقرة: ١٠٢.

(٣) سورەتی ص: ٣٠.

(٤) سورەتی ص: ٢٥.

بەسەرهاتی

# پێغەمبەرئەییوب

# و

# پێغەمبەریونس

سڵاوی خوایان لێبێ

## ١-بەسەرهاتی ئەییوب چەشنێکی ترە لە بەسەرهاتەکان

بەسەرهاتەکەی پێغەمبەر ئەییوب چەشنە بەسەرهاتێکی ترە لەو بەسەرهاتانەی کە لە قورئانی پیرۆز باسکراون، دیمەنێکی ترە لەو نیعمەتانەی کە خوا بە بەندە بڕوادار و ئارامگر و سوپاسگوزار و بە پێغەمبەرە خۆشەویستەکانی دەبەخشێ.

پێغەمبەر ئەییوب ماڵ و منداڵ و وشتر و وڵاخێکی زۆر و زەوی و زارێکی فرەوانی هەبو، خوا بەڵایەکی بەسەر هێنا هیچی نەما و هەموی فەوتا، پاشان خۆشی نەخۆش کەوت، تەواوی جەستەی توشی نەخۆشی ببو تەنها زمان و دڵی نەبێ کە یادی خوای پێدەکردن، بەهۆی ئەم نەخۆشیەوە خۆی لە خەڵکی بە دور گرت و لە کەنارێکی دور لە ئاوایی بۆ خۆی ژیانی بەسەر دەبرد، هیچ کەس سۆزی بۆ نەدەبزوا، تەنها خێزانەکەی نەبێ ئەو خزمەتی دەکرد، پاشان ئەویش ئاتاج و بێدەرامەت[1] بو، ناچار خزمەتی خەڵکی دەکرد تا بڕێ پارە پەیدا بکا و بتوانێ خزمەتی ئەییوبی پێبکا.[2]

## ٢- سەبری ئەییوب

پێغەمبەر ئەییوب لەگەڵ ئەم هەمو نەهامەتی و نەخۆشیەشدا هەر ئارامگر و سوپاسگوزار بو، بەردەوام یادی خوای دەکردەوە، هەمیشە سوپاسی خوای دەکرد و سکاڵای دەرنەدەبڕی، گازاندەی نەدەکرد، بێزار و تورە نەدەبو، چەند ساڵێك ئاوا مایەوە.

---

(١) ئاتاج: موحتاج. بێدەرامەت: بێداهات.

(٢) ئەم دەستەواژەیە هی (ابن کثیر)ـە کە لە تەفسیرەکەیدا نوسیویەتی.

## ٢- نەهامەتی و خەڵات

خوا مەبەستی بو پێغەمبەر ئەییوب تاقیبکاتەوە تا پلەوپایەی بەرز بکاتەوە و بە قەزاوقەدەری خوا ڕازی بێ، پاشان کە ئەییوب لە تاقیکردنەوەکە سەرکەوت، خوا نزایەکی خستە ناو دڵی کە واتای دەستەوەستانی و ناگزوری تێدا دەفامرێتەوە، هەروەها ئەوەشی تێدا دەردەکەوێ کە تەنها خوا ڕزگارکەری زەبونانە، تەنها خوا توانای بەسەر هەمو شتێکدا دەشکێ.

خوای گەورە تاقیکردنەوەکەی لەسەر هەڵگرت و نەخۆشیەکەی لە کۆڵ کردەوە و ماڵ و منداڵێکی زۆر زیاتری پێبەخشیەوە.

خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ﴾[١] واتە: ئەییوب هاواری خوای کرد و گوتی: پەروەردگارا! من توشی دەرد و بەڵا بومە تۆش لە هەمو میهرەبانێك میهرەبانتری. ئێمەش دەرد و بەڵاکەمان لەسەر هەڵگرت و دوقات ماڵ و منداڵمان پێبەخشیەوە، ئێمە میهرەبانیمان لەگەڵدا کرد، ئەوانەی خواپەرستن پەند لەم ڕوداوە وەردەگرن﴾.

(١) سورەتی الأنبياء(٨٣-٨٤)

## ٤- بەسەرهاتی پێغەمبەر یونس

بەسەرهاتی پێغەمبەر یونس دوابەدوای بەسەرهاتی پێغەمبەر ئەییوب باسکراوە ئەمیش وەك ئەو دەسەڵات و میهرەبانی و هاریکاری خوا نیشان دەدەن، لەو کاتانەی کە هیوا نامێنێ و بێهومێدی و تاریکی دڵ دادەگرن و پەنجەرەکان قەپات دەبن[1]، کە نە ڕوناکی و نە هەوا، نە هومێد و نە هیوا نامێنێن و دەبڕێنەوە، کە بەرداشی مردن زۆر بەهێز و بەخێرایی دەگەڕێت و دانەوێڵەکەی دەهاڕێت.

ئا لەم ساتەدا توانای بەهێز و بەحیکمەت و میهرەبانی پەروەردگار وەدەردەکەوێ و بەندەی ناگزور[2] لە نێو شەویلاگی شێری دڕندە و مەرگی لەناوبەر رزگار دەکا، بێئەوەی بریندار بوبێ، بێئەوەی کەموکوڕی تێکەوتبێ، وەك بڵێی لەسەر جێگەی گەرم و نەرمی ماڵەوە بوبێ و توشی هیچ دەرد و بەڵایەك نەبوبێ.

## ٥- یونس لەنێو نەتەوەکەی

فەرمو ئەمەش بەسەرهاتی پێغەمبەر یونسە:

خوا یونسی بۆ خەڵکی (نەینەوا) نارد، ئەویش بەرەو لای خوا بانگی کردن، بەڵام خەڵکەکە بانگەوازەکەیان ڕەت کردەوە و پتر لە بێبڕوایی شۆڕ بونەوە، یونس بە توڕەییەوە بەجێی هێشتن و ڕۆیشت، هەڕەشەشی لێکردن کە دوای سێ ڕۆژ سزای خوایان بۆ دادەبەزێ.

---

(١) قەپات دەبن: دادەخرێن.

(٢) ناگزور: پێویست، موحتاج.

پاشان خەڵکەکە لێیان کۆڵیەوە بۆیان دەرکەوت ڕاستە یونس پێغەمبەرە و پێغەمبەرانیش هەرگیز درۆ ناکەن، هەمو مشاوەش بون و هەرکەسە و منداڵ و وشترو مەڕوماڵاتی خۆی ڕەگەڵ خۆدا و بەرەو بیابان کەوتنە ڕێ، لەوێ لە خوا پاڕانەوە و دەنگی نزا و لالانەوە بەرز دەبوەوە، وشتر و بێچوە وشتر دەیانکورکاند، چێڵ و گوڵك دەیانبۆڕاند، مەڕوماڵات دەیانباڕاند.. دەنگە دەنگی پاڕانەوە ئەو ناوەی پڕ کردبو، خوای گەورە نزا و پەشیمانبونەوەکەی قبوڵ کردن و سزاکەی لەسەر هەڵگرتن.

خوا لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُوا۟ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ عَذَابَ[1] واتە: دەبوایە گشت نەتەوە بێبڕواکانی پێشو کە لەناومان بردن بڕوا بێنن تا لە سزای خوا ڕزگار بن، تەنها نەتەوەکەی یونس وابون بەر لەوەی سزاکەیان بەسەر ڕابگا بڕوایان هێنا، ئێمەش سزای ڕیسواکەری دنیاییمان لەسەر هەڵگرتن﴾.

## ٦- یونس لە هەناوی نەهەنگدا

بەڵام یونس (سڵاوی خوای لێبێ) چو لەگەڵ چەند کەسێ سواری کەشتیەك بو و ڕۆیشت، کەشتیەکە لەناو ئاودا خەریکبو لایەکی نقوم بێ، خەڵکەکە لەوە ترسان نوقم بن و بخنکێن، تیر و پشکیان هاوێشت تا یەکێ هەڵدەنە ناو ئاو و باری کەشتیەکە سوك ببێ، تیر و پشکەکە کەوتە سەر یونس، بەڵام پێیان ناخۆش بو و هەڵیاننەدایە ناو ئاوەکە، دوبارە تیر و پشکیان هاویشتەوە

(١) یونس: ٩٨.

ئەمجارەش هەر کەوتەوە سەر یونس، دیسان ڕازی نەبون و هەڵیان نەدایە ناو ئاوەکە. سێبارە تیر و پشکیان هاویشتەوە و بۆ سێیەم جاریش هەر کەوتەوە سەر یونس.

یونس (سڵاوی خوای لێبێ) هەڵسا خۆی ڕوت کردەوە و خۆی هەڵدایە ناو دەریا، خوای گەورە نەهەنگێکی[1] نارد، نەهەنگ لە دورەوە دەهات دەریای دەبڕی تا گەیشتە لای یونس، کاتێك کە یونس خۆی هەڵدایە ناو دەریا نەهەنگەکە قوتی دا، خوا فەرمانی بە نەهەنگەکە کرد گۆشتی یونس نەخوا و ئێسقانی تێکنەشکێنێ.

## ٧- خوا نزاکەی قبوڵ کرد

یونس لەناو تاریکایی هەناوی نەهەنگ بو، لەناو تاریکی دەریا بو، لەناو تاریکی شەو بو، تاریکایی لەسەر تاریکایی بو، تاریکاییەکی تاریك تاریك! یونس ئەوەندەی خوا خەملاندبوی[2] لەناو هەناوی نەهەنگەکەدا مایەوە، پاشان خوای گەورە چەند وشەیەکی خستە دڵی، وشەکان تاریکاییان دەتاراند و تەنگانەیان لادەبرد و ڕەحمەتی خوایان لە بەرزایی حەفت ئاسمانان دادەبەزاند.

گوێ بگرە بزانە قورئان چۆن باسی ئەم بەسەرهاتە ناوازەیە دەکا کە دەبێتە مایەی دڵدانەوەی ئەو کەسانەی کە توشی بەدبەختی بونە و کۆسیان

(١) نەهەنگ: ماسی زل، حوت.

(٢) خەملاندبوی: تەقدیری کردبو.

کەوتوە[١]، کە هیوایان نەماوە و پەشۆکاون و دنیایان لەسـەرخۆ وێکهێنـاوە و بە چاوانی خۆیان دەبیـنن ڕێگەچـارەیان لـێ بـڕاوە و ڕێـی ڕزگارییـان لـێ گیراوە...

﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٨٧ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾.[٢] واتـــە: یونس بە توڕەییەوە نەتەوەکەی بەجێهێشت و ڕۆیشت، وایزانی تەنگی ناخەینە سەر، پاشان لە ناو تاریکاییەکان هاواری کرد و گوتی: خوایە جگە لە تۆ هیچ خواوەندێکیتر نیە من ستەمم دەرهەق بەخۆم کردوە. ئێمەش نزاکەمان قبـوڵ کرد و لە خەم و پەژارە ڕزگارمان کرد، ئێمە بەجۆرە بڕوادارەکان لـە تەنگانـە ڕزگار دەکەین﴾.

(١) کۆس کەوتن: توشی تەنگانەبون.
(٢) الأنبياء: (٨٨/٨٧).

## ١- نزای زەکەریا بۆ ئەوەی کوڕێکی چاکەکاری ببێ

جۆرە نیعمەتێکیتر کە خوا بە بەندەکانی دەبەخشێ و نیشانەیەکیتر لە نیشانەکانی توانستی خوای پەروەردگار کە بەسەر هەمو شتێ زاڵە ؛ لە نزاکەی زەکەریاوە دەردەکەوێ کە لە خوا پاڕایەوە تا کوڕێکی چاکەکار و لەخواڕازی و لەخواترسیان پێببەخشێ و، میراتی ئالی یەعقوب هەڵگرێتەوە و بانگەواز بۆ پەرستنی خوا بکا.

زەکەریا ئەوکاتی بە ساڵدا چوبو، لەشولاری لاواز و بێهێز ببو، نیشانەکانی پیر و پەککەوتەیی لێدەرکەوتبو، هیچ هومێدێ نەبو ژنەکەی منداڵی ببێ، بەلام خوای گەورە نزاکەی قبوڵ کرد و بۆچونی خەڵکی بە ناڕاست دەرخست و ئەزمونەکانی پێشانی پوچاندەوە، خوا کوڕێکی زیرەك و ئازای پێبەخشی، هەر لە منداڵییەوە بلیمەت و دانایی و زیرەکی و زانایی و نیشانەی پێغەمبەرایەتی پێوە دیار بو، کوڕێکی زۆر بەسۆز و چاکەکار و لەخواترس بو، لەگەڵ دایك و باوکی گەلێ چاك بو، دڵنەرم و بە بەزەیی و بە تەنگ خەڵکەوە بو.

زەکەریا بە هۆشی دڵ بیری لە نیشانە مەزنەکانی[1] خوا دەکردەوە کە بۆ توانای بەرفرەوانی خوای میهرەبان بەڵگەی رون و ئاشکران، دەیدی گشت کاروبارێ بە توانا و ویستی خواوە هەڵدەسوڕێ، خوا بە ئیرادەی خۆی چی بوێ دەیهێنێتە دی، دەیدی بە ویستی خواوە جەستەی مرۆڤ دەجولێ یان شەلە و گۆجە دەبێ، بیری لەوە دەکردەوە کە سەرتاپای گەردون لەژێر دەستی پەروەردگارە، هەر خوا زندو لە مردوان و مردو لە زندوان وەدی دێنێ، هەر خوا رزق بەخەڵك و بونەوەران دەبەخشێ.

---

(١) مەزن: گەورە.

## ٢- نەزرەکەی ژنی عیمران

ژنی عیمران کە ئافرەتێکی چاکەکار و دینداری بنەماڵەی پێغەمبەر زەکەریا بو، زۆری خوا خۆش دەویست، نەزری لەگەڵ خوا کرد ئەگەر کوڕێکی پێببەخشێ لەبەر خزمەتی ئاینی دابنێ، لە خوا پاڕایەوە لەم کوڕەی کە پێی دەبەخشێ ڕازی بێت و بیکاتە کەسێکی سود بە ئاین و بە خەڵکی بگەیەنێ، لە خوا پاڕایەوە کوڕەکەی ببێتە پێشەوا و بانگخوازێکی دینی خواو خەڵك بەرەو ڕێی ڕێنوێنی بانگ بکا.

## ٣- گوتی: خوایە کچم بو!

ژنە چاکەکارەکە کارێکی دەویست و خوای گەورەش کارێکی تر!، خوا ئاگای لە بەرژەوەندی بەندەکانیەتی، ژنە چاکەکارەکە کچێکی بو، بۆیە تەمی خەم لەسەر دڵی هەڵنیشت و پەرێشان بو. کچی بو بەڵام کچەکە وەك کچانی تر نەبو، بۆ خواپەرستی لە هەموان بەهێزتر بو، بۆ فەرمانبەری و چاکەکاری لە زۆربەی ئافرەتان گورجوگۆڵترو ورەبەرزتر بو. خوا لەبەر چەندین حیکمەت کە خۆی پێیان ئاگادارە باری وا خەملاند منداڵەکە کچ بێ، دیارە کە پێغەمبەرانیش نابێ ئافرەت بن چونکە ناتوانن ئەرکی پێغەمبەرایەتی ڕاپەڕێنن، بۆیە خوا ویستی بیکاتە دایکی پێغەمبەرێکی چاکەخواز و بەڕێز.

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ ۖ وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا

بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾[١] واتە: ژنەکەی عیمران گوتی: پەروەردگارا! من نەزرم لەخۆ گرتوە ئەو منداڵەی ناو زگم لەپێناو تو لە خزمەت عیبادەتکردنی تۆ تەرخان دەکەم، خوایە نزایەکەم لێ قبوڵ بکە تۆ بیسەر و زانای. جا کە زگەکەی دانا گوتی: خوایە ئەوە کچە!، هەڵبەت خوا زاناترە کە زگەکە کچ بو، کوڕانیش وەك ئەم کچە نین، خوایە! ناوم نا مەریەم و خوایە خۆی و نەوەکانی بە پەنای تۆ دەپارێزم لە شەیتانی﴾.

## ٤- چاودێری خوا بۆ کچی چاکەکار

زەکەریا بەهۆی خزمایەتیەوە بەخێوکردنی کچەکەی گرتە ئەستۆ، هەروەها خواش چاودێری دەکرد، خوا بەروبوم و میوەی وای بە مەریەم دەبەخشی کە هەم کاتی پێگەیشتنی شتی وا نەبو هەمیش لەو شوێنە شتی وا نەدەڕوا، چ جۆرە میوەیەکی بویستبایە و چەندیشی حەز لێبوایە خوا پێیدەبەخشی.

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ۖ قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾[٢] واتە: خوا ئەو پێشکەشیەی گەلێ بەباشی لێوەرگرت و پەروەردەیەکی پاك و پوختەشی کرد، زەکەریاشی بۆ بەخێوکردنی تەرخان کرد، زەکەریا هەرچەند جاری دەچوە میحرابێ بژێوی لەلای دەدی. گوتی: مەریەم! ئەم میوە و خواردنەت لە کوێ بو، گوتی: لە لایەن خواوە بۆم دێ، خوا بێ‌حیساب رزق و ڕۆزی بە کەسانێ کە بیەوێ دەبەخشێ﴾.

---

(١) آل عمران: (٣٥-٣٦).
(٢) آل عمران: ٣٧.

## ٥- ئیلهامێك لەلایەن پەروەردگاری میهرەبانەوە

خوا ئیلهامی خستە ناو دڵی پێغەمبەر زەکەریاوە، زەکەریا کە پێغەمبەرێکی زۆر زیرەك و بلیمەت بو، خوا ئیلهامی خستە ناو دڵی: ئەگەر خوا رێز لە ئافرەتێکی چاکەکار بگرێ و میوەی ناوەختەی بۆ بێنێتە بەر دەستی ـ کە دایکی نەزری لەخۆی گرتبو و نزای چاکی بۆ کردبو، خۆشی دڵسۆزانە بە فەرمانبەریکردن و پەرستنی خواوە خەریکبو ـ ئەوا هیچ گومانی تێدا نیە ئەگەر پیرێکی وەك ئەویش هەرچەند بە ناوساڵ کەوتوە و نیشانەکانی پیر و پەککەوتەیی لێ وەدەرکەوتوە و بێهێز و لاواز بوە، لە خوا بپارێتەوە خوا توانای هەیە کوڕێکی پێببەخشێ، هەرچەندە لە بڕوای کەس نیە منداڵی ببێ، چونکە خێزانەکەی نەزۆکە و باویش وا رۆییوە پیاو لە حاڵی وادا منداڵی نابێ.

زەکەریا دەرونی وەکەفوکوڵ کەوت و ورەی بەرز بۆوە، هیوای هاتەوە بەر و متمانەی بە خوا بەهێزتر بو، لەم حاڵەتەدا بە جۆرە نزایەك پاڕایەوە کە فریشتەکان بڵێن ئامین و بەزەیی خوای بۆ ببزوێ، نزاکەی لەلایەن خوای میهرەبانەوە وەك ئیلهامێك کەوتە دڵێو وەك قەدەرێك لە لایەن خواوە بۆی هاتەدی.

خوا دەفەرموێ: ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ ۖ قَالَ رَبِّ هَبْ لِى مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً ۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾[1] واتە: ئا لێرەدا زەکەریا پاڕایەوە و گوتی: خوایە کوڕێکی چاك و پاکم پێببەخشە، خوایە خۆت قبوڵکەری نزایانی﴾.

---

(١) آل عمران: ٣٨.

## ٦- موژدەی پێبەخشینی کوڕێك

خوا نزاکەی زەکەریای قبوڵ کرد و موژدەی پێڕاگەیاند کە بەم زوانە کوڕێکی چاکەکاری دەبێ.

مرۆڤ لە پەلەپەل خولقێنراوە، زەکەریا داوای لە خوا کرد نیشانەیەکی وای پێڕابگەیەنێ بەڵگە بێ بۆ نزیکبونەوەی ئەم ڕوداوە گەورەیە.

گوتی: خوایە نیشانەیەکم بۆ دابنێ، خوا فەرموی: نیشانەکەت ئەوە بێ بۆ ماوەی سێ شەو و سێ ڕۆژان نەتوانی بە زمان لەگەڵ خەڵکی بدوێی مەگەر بە ئاماژە، هەروەها زۆر زۆریش یادی خوا بکە، لە سپێدە و لە ئێواران پاکیاگاری پەروەردگارت بکە.

ئەو خوایەی توانای هەبێ سیفەت لە شتان دامالێ و زمانی ساغ و بێخەوش لاڵ بکا، دەشتوانێ هەر سیفەتێکی مەبەست بێ بە دروستکراوەکانی ببەخشێ، ئەو بەهێزەی بتوانێ شتێك بستێنێ دەشتوانێ شتێك ببەخشێ.

## ٧- نیشانەکان و توانای خوا

نیشانەکان و توانای خوا یەکەمجار لە جەستەی زەکەریاوە دەرکەوت پاشان لە بنەماڵە و خانەوادەکەی، زەکەریا یەحیای بو، بە یەحیا دڵخۆش و ئاسودە بو، پشتی پێ بەهێز و قایم بو، بانگەوازەکەی پێ ژیاوە.

گوێ بۆ قورئان ڕادێرن کە هەندێ جار بە کورتی و هەندێ جاریش بە درێژی باسی ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: ﴿وَزَكَرِيَّآ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٨٩﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَوَهَبْنَا لَهُۥ يَحْيَىٰ وَأَصْلَحْنَا لَهُۥ زَوْجَهُۥٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ

﴿وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ﴾.[1] واتە: زەکەریا لە خوا پاڕایەوە و گوتی: پەروەردگارا! بە تەنیایی مەمهێڵەوە، با کوڕێکم هەبێ شوێنەکەم بگرێتەوە، خوایە تەنها خۆت بە تەنیایی دەمێنیەوە. ئێمەش یەحیامان پێبەخشی و ژنەکەیمان لە نەزۆکی چاك کردەوە، ئێمە لەبەر ئەوە وەڵامی نزاکەی پێغەمبەران دەدەینەوە چونکە پێشبڕکێ دەکەن بۆ کاری چاکە و بە ترس و تەماوە دەپاڕێنەوە، لە نهێنی و ئاشکراشدا بۆ خوا ملکەچ و فەرمانبەرن﴾.

## ٨- یەحیا ئەرکی بانگەواز لە ئەستۆ دەگرێ

پاشان یەحیا لە دایك دەبێ و دەبێتە مایەی دڵخۆشی باوکە بەڕێزەکەی، دەبێتە جێنشینی باوکی و ئەرکی بانگەواز دەگرێتە ئەستۆ.

یەحیا هەر لە منداڵییەوە نەجیمزادەیی لێ وەدی دەکرا، هێشتا بچوك بو پڕ بە دڵ ڕوی لە فێربونی زانست کرد، لە گەنجێتیشدا چاکەکارێکی زۆر لەخواترس بو، لە ناو برادەرەکانیدا لە هەموان خۆشەویستتر بو، هەتا بلێی بۆ دایك و باوکی باش بو، تەنانەت خەڵك ئاماژەیان پێدەکرد.

خوا لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿يَٰيَحْيَىٰ خُذِ ٱلْكِتَٰبَ بِقُوَّةٍ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحُكْمَ صَبِيًّا ﴿١٢﴾ وَحَنَانًا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةً ۖ وَكَانَ تَقِيًّا ﴿١٣﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَيْهِ وَلَمْ يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّا ﴿١٤﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا﴾[2] واتە: یەحیا ئەم پەرتوکە توند بگرە، ئێمە هەر لە منداڵیەوە فامێکی فرەوانمان

---

(١) الأنبياء: ٨٩-٩٠.

(٢) مريم: (١٢-١٤).

پێبەخشی بو. ئێمە وەك سۆز و میهرەبانی و مشتومالێك لە كاری خراپ ئەو فام و پێغەمبەرایەتیەمان پێبەخشی، یەحیا لەخواترس بو، لەگەڵ دایك و باوكی چاكەكار بو، لوتبەرز و ستەمكار و سەرپێچیكار نەبو، سڵاوی خوا لە یەحیا بێ لەو كاتەی لە دایك بوە و لەو كاتەی كە دەمرێ و لەو كاتەش كە زندو دەبێتەوە﴾.

## بەسەرهاتی

# پێغەمبەر عیسا

## سلاوی خوای لێبێ

# ١- بەسەرهاتێکی لەیاسابەدەر

ئەوجا ڕۆژگاری (گەورەمان: عیسا) دادێ، کە بەر لە پێغەمبەرمان: محمدﷺ دواهەمین پێغەمبەر بوە، لە بەسەرهاتەکەی عیسادا ویستی بە دەسەلات و توانای بێسنور و حیکمەتی وردی خوا دەردەکەوێ.

عیسا هەمو کارەکانی لە باو[١] دەرچوبون، لەدایکبونەکەی باو نەبو لە یاسا بەدەر بو، یاسا سروشتیەکان دەستیان تێدانەبو، تەنانەت هۆش و دڵ سەرسام ببون تەنها ئەو کەسانە زۆریان لەبەر زەحمەت بو بڕوا بەم لەدایکبونە نائاساییە بێنن کە پێیانوابو یاسا سروشتیەکان خواوەندن و گۆڕان و فەوتانیان بەسەر نایێ... کە پێیانوابو یاسا پزیشکی و سروشتیەکان ڕێسای جێگیر و نەگۆڕن... کە شارەزای توانای زاڵ و بێسنور و ئیرادەی بێ بەربەستی خوا نەبون: ﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ وَذَلَّلۡنَٰهَا﴾[٢] واتە: ئەمری خوا وایە ئەگەر مەبەستی شتێك بێ پێی دەڵێ ببە دەبێ﴾.

بەڵام ئەو کەسانە زۆریان پێ ئاسان بو بڕوا بەم لەدایکبونە نائاساییە بێنن کە بڕوایان بەخوا هێنا بو و دەیانزانی خوا بە توانایە و ویستی زاڵە و ئافەریدگار و کردگارێکی بێوێنەیە. ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٱلَّذِينَ﴾[٣] واتە: خوا وەدیهێنەر و داهێنەر و وێنەبەخشە، چەندین ناوی جوانی هەیە، ئەرز و

---

(١) باو: عادەت.

(٢) یس: (٨٢).

(٣) الحشر: (٢٤).

ئاسمانەکان پاکیگاری ئەو دەکەن، خوا بە دەسەڵات و کاربەجێیە﴾.

ئەو کەسانەی بڕوایان بە ئادەم هەبو کە خوا لە خۆڵ و ئاو و بێ دایك و باوك خەلقی کردوە، بە ئاسانی بڕوایان بە عیسا دێنا کە خوا لە دایك و بێ باوك خەلقی کردوە، بۆیە خوا لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾[1] واتە: خەلقی عیسا لەلای خوا وەك خەلقی ئادەمە کە ئادەمی لە خۆڵ دروست دەکرد و پاشان پێیگوت ببە، ئەویش بو﴾.

## ٢- گشت کارەکانی سەیر بون

کارەکانی گەورەمان عیسا سەیر بون، لە دایکبونەکەی لە سەردەمێك بو کە یۆنان لە زانستە عەقلی و بیرکاریەکاندا گەیشتبونە ئەوپەڕی پێشکەوتن و، زانستی پزیشکی ڕۆڵێکی باڵای دەگێڕا و چارەسەری سەیر سەیری دەدۆزیەوە.

## ٣- ملکەچبونی جولەکەکان بۆ هۆیە ڕواڵەتیەکان

جولەکەکان کە گەلێك پێغەمبەریان لەناو پەیدا بوە بۆ زانستە بەربڵاوەکەی ئەو سەردەم ملکەچ ببون، بڕوایان بە ڕوح و هەرچی پەیوەندی بە ڕوح هەبو نەمابو، هەمو شتێکیان بە لێکدانەوەیەکی ماددی لێکدەدایەوە، پێیانوابو گشت شتێك دەبێ بەهۆو هۆکار پەیدا ببێ. ئەو موعجیزانەی کە خوا بە پێغەمبەر عیسای بەخشی چارەسەری ئەو عەقڵیەتە ماددییە تەسکەی دەکرد و رزگارکەری ئەو ڕۆژگارە بێڕوحە بو.

---

(١) آل عمران: ٥٩.

جولەکەکان لەڕاددەبەدەر لە ڕواڵەتیان دەڕوانی، توێکڵیان وەردەگرت نەك کاکڵ، دیمەنیان دەدی نەك هەقیقەت، لە ڕاددەبەدەر ڕەگەز و خوێنیان بە پیرۆز دەزانی، تا ناخی دڵ پارەوپول و ماڵی دنیایان خۆشدەویست وێڵ و عەودالی[1] خۆشی دنیا بون، دڵڕەق و سروشت وشك بون، بەزەییان بە لاواز و بێدەسەڵاتان نەدەهاتەوە، زگیان بە هەژاران نەدەسوتا، وەك ئاژەڵ و سەگ و دار و بەرد ڕەفتاریان لەگەڵ غەیرە ئیسرائیلیەکان دەکرد، ملکەچی دەسەڵاتدار و دەوڵەمەندان دەبون، لاف و گەزافیان لەسەر هەژاران لێدەدا، لەکاتی دەسەڵاتداریدا توندوتیژ بون، لەکاتی بێدەسەڵاتیدا نەرم و زەبون بون، ئەو ژیانە زەبون ئامێزەی کە بەدرێژایی ڕۆژگار لە سوریا و لە فەلەستیندا لە ژێر حوکمی ڕۆمەکان بەسەریان برد وای لێکردبون چروك و دوڕو و فێڵباز و زۆرزان بن و پەنا وەبەر کاری نهێنی و پلانگێڕان ببەن.

## ٤- بە سوك سەیرکردن و یاخیبون

وێڕای ئەم کارانە، بەرامبەر بە پێغەمبەرانیش بێڕێز و بە هەڕەشە بون تەنانەت دەشیانکوشتن، مامەڵەیان بە ڕیبا و زێدەکی بو، گاڵتەیان بە ئامۆژە[2] ئاینیەکان دەهات، دڵڕەق و ڕو وشك بون، سۆزی مرۆڤانەیان لاواز بو، دڵی زۆربەی هەرە زۆریان لە خۆشویستنی خوا خاڵی بو، بەزەییان بە هیچ مرۆڤێك نەدەهاتەوە جا مرۆڤەکە لە هەر ڕەگەز و نەژادێك بوایە، ڕێزی هیچ مرۆڤێکیان نەدەگرت، خەریکبو واتاکانی هاریکاری و یەکسانی و چاکەکاری و مەردانەیی لەبیر بکەن.

---

(١) عەودال: شەیدا.

(٢) ئامۆژ: تعالیم.

بڕوایـان بـە پـەیام و پەیامبـەران هـەبو، گـەلێك پێغەمبەریـشیان لـەناو هەڵکەوتبو، پەڕاوەکانیان زۆریان لەبارەی پێغەمبەرانەوە تێدا نوسرا بـو، بـەڵام لەم ڕۆژگارەی دواییـدا تـەنها بڕوایـان بەوانـە دەکـرد کـە دەگـەڵ هەوەسـت و ئارەزوەکانیان تێکی دەکردەوە و دەگەڵ رابردوی ژیان و ڕەوشتیان دەگونجا، بەڵام هەر پێغەمبەرێك کە ڕەخنەی لـێگرتبون و لێپرسینەوەی لەگـەڵ کردبـون و بـۆ لای دینی ڕاست و سەر ڕێی هەقی بێ پێچ و پەنا بانگی کردبون و هەوڵی لەگەڵ دابون چاك بسازێنەوە؛ دژایەتیان دەکرد و بە دوژمنیان هـەژمار دەکـرد، بـەبێ پەروا[1] بوختان و درۆ و دەلەسـەیان پێهەڵدەبەسـتا، هـەقیان دەشـاردەوە و بـە ساختە گەواهییان دەدا.

## ٥- نیعمەتی خوا بۆ نەوەی ئیسرائیلیەکان

نـەوەی ئیـسرائیل نەتەوەیـەك بـو تازیـارێتی[2] بەسـەر نەتـەوە هاوسـەردەمەکانیدا هـەبو، تازیاریەکـەش بریتـی بـو لـە بیروبـاوەڕی خـوا بەیەکناسی. ئەمە بو کە خوا لەناو سەرجەم نەتـەوە هاوچـەرخەکاندا بـە وانـی بەخشیبو.

خـوا دەفـەرموێ: ﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾[3] واتە: ئەی نـەوەی ئیـسرائیل! ئـەو نیعمەتانـەتان بەبیر بێتەوە کە بە ئێوەم بەخشیبو، کە ئێوەم لەناو سەرجەم نەتەوەکاندا بەباشتر هەڵبژراد﴾.

---

(١) پەروا: ترس.

(٢) تازیارێتی: بەسەردا هەبون، ئیمتیاز.

(٣) البقرة: (٤٧).

## ٦- سپڵەیی[١]

بەڵام لەبەرئەوەی دراوسێی گەلانی بتپەرست بون و لەمێژیش بو ئامۆژی پێغەمبەرانیان لەناودا کۆن ببو، بۆیە گەلێك بیروباوەڕی پوکەڵ و نەریتی نەفامێتیان تێکەوتبو. لە میسر گۆلکیان[٢] پەرست و عوزەیریشیان هێند بە پیرۆز و گەورە گرت تەنانەت لە سنوری مرۆڤێتیان بردبوە دەرەوە. ئەوەندە بێ چاو و ڕو بون تەنانەت هاوبەشپەرستی و بتپەرستی و گەلێك جادوگەری و بێبیروایی ۆ کاری بێڕەزا و نەشیاویان دابوە پاڵ هەندێ لە پێغەمبەران، ڕێزیان نەدەگرتن و لە خوا نەدەترسان.

## ٧- بەخۆنازین و خۆهەڵکێشان

وێڕای ئەم سیفەتە قرپۆکانە شانازیان بە نەژاد و ڕەچەڵەك دەکردو خۆیان بە خزمایەتی پێغەمبەران هەڵدەکێشا، دەیانگوت: ئێمە دۆست و خۆشەویستی خواین، ئەگەر بچینە ناو دۆزەخیش تەنها چەند ڕۆژێکی تێدا دەمێنینەوە.

## ٨- لەدایکبونی مەسیح لەگەڵ شتە بەرهەستەکان بەرەنگار دەبێتەوە

لە دایکبون و ژیان و گوزەران و بانگەوازی مەسیح بەرەنگاری هەمو شتە بەرهەست و هۆ و هۆکارەکان دەبوەوە. بۆ نەریتە بەربڵاوەکان، بۆ باوە دێرینەکان، بۆ یاسا داڕێژراوەکان، بۆ ئەو سەرمەشقانەی کە جولەکە بڕوایان

(١) سپڵەیی: بێنەمەکی، پێنەزانین.
(٢) گۆلك: گوێرەکە.

پێ‌هەبو، بۆ ئەو مەبەست و ئامانجانەی کە مونافەسەیان لەسەر دەکرد و شەڕ و کوشتاریان لەپێناودا بەرپا دەکرد، بۆ هەمو ئەمانە لە بەرەنگاری دابو.

چونکە لە دایکبونەکەی بە ڕێگەیەکی ناباوی[1] بو، لەناو بێشکە قسەی لەگەڵ خەڵك کرد، لە باوەشی[2] دایکێکی هەژارو داوێنپاك گەورە بو، لە دەوروبەرێکی پڕ لە توانج و تۆمانج[3] و تانە و تەشەر گوزەرا، لە ڕواڵەتی خۆ بە گەورەزانی و بێباکی دور بو، لەگەڵ هەژاران دادەنیشت و نانی دەخوارد، زگی پێدەسوتان و بەزەیی بۆ دەبزوان. یارمەتی بێهێز و غەریبانی دەدا، جیاوازی لە نێوان هەژار و دەوڵەمەندان و فەرمانڕەوا و بەرفەرمان و پایەدار و کەساسان[4] نەدەکرد.

## ٩- موعجیزەکانی مەسیح

خوا سروش و پێغەمبەرایەتی بە مەسیح بەخشی، ئینجیلی دایێ، بە ڕوحی پیرۆز پشتی بەهێز کرد، گەلێك موعجیزەی مەزنیشی پێدا، خوا نەخۆشی وای پێ‌چاك دەکردەوە کە پزیشکەکان پێیان چارەسەر نەدەبو، کوێر و بەڵەك و گڕوی چاك دەکردەوە، مردوی بە ئیزنی خوا زندو دەکردەوە، لە بەر چاوی خەڵك قوڕی دێنا پەیکەری باڵندانی لێ دروست دەکرد و پاشان فوێکی تێ دەکرد و دەستبەجێ بە ئیزنی خوا ڕوحی دەهاتە بەرێ و دەبوە باڵندەیەکی ڕاستەقینە و بە ئاسمانێدا هەڵدەفڕی، دەیزانی خەڵك لە ماڵەوە چ جۆرە خواردنێ دەخۆن و چ جۆرە ئازوقەیەکیشیان هەڵگرتوە و بە خەڵکەکەشی ڕادەگەیاند.

---

(١) ناباوی: ناعادەتی.
(٢) باوەش: ئامێز.
(٣) توانج: تانە و تەشەر. تۆمانج: بوختان.
(٤) کەساس: خاکەسەر.

بەهۆی ئەم موعجیزانەوە خەڵکی لە موعجیزەی پێغەمبەران دەگەیاند کە لە تەورات باسکرابون و متمانەی بۆ دروست دەکردنەوە، توانای بێسنوری خوای بۆ ڕون دەکردنەوە، بڕوای بۆ نوێ دەکردنەوە، پەرستنی ئەزمون و هۆ و هۆکارداری بۆ بەدرۆ دەخستنەوە.

بەڵام ئەوانەی کە توانستی بەرفرەوانی خوایان نەدەسەلماند و بڕوایان بە هێزی ویستی پەروەردگار نەبو بەرەنگار بونەوە و گوتیان: نەخێر، ئەوەی هەبێ و نەبێ هەر ئەوەیە کە ئێمە دەیزانین و لەڕێی ئەزمونەکانەوە دەیبینین.

## ١٠- بانگەوازی مەسیح و بڕوا پێنەکردنی جولەکەکان

جولەکەکان لە ناو خەیاڵ ڕۆچوبون و گەلێ شتیان بە ناڕاست و درۆ دەزانی، گەلێ شت کە خوا حەڕامی کردبو ئەوان حەڵاڵیان دەکرد، گەلێ شتیش خوا حەڵاڵی کردبو ئەوان حەڕامیان دەکرد، مەسیح بانگەوازی ڕاگەیاند و جولەکەکانی بەرەو روح و ناواخن و بنەڕەت و هەقیقەتی دینی خوا بانگ دەکرد، هەوڵی لەگەڵ دەدان تا خوایان لە گشت شتێ خۆشتر بوێ، تا ڕێزی مرۆڤایەتی بگرن و بەزەییان پێدا بێنەوە، تا هاریکاری هەژاران بن، تا بە پاکی خوا بپەرستن و گشت باو و نەریتە نەفامی و بیروباوەڕە پوکەڵەکان ڕەت بکەنەوە.

## ١١- جولەکەکان شەڕی لە دژدا بەرپا دەکەن

جولەکەکان بانگەوازەکەیان لەسەر دڵی گران بو، بۆیە هەمو پێکڕا دەست لەناو دەست شەڕیان لە دژ ڕاگەیاند و دوژمنایەتیان لەگەڵ پەیدا کرد، توانج و تۆمەتیان دەخستە پاڵ، جوێنی دزێو و قسەی ناشرینیان پێدەگوت، بوختانی

داوێنپیسیان بە مەریەمی دایکی هەڵدەبەستا و تانە و تەشەری ناقۆڵایان تێدەگرت، بە هەمو جۆرێك بە پێچەوانەی بانگەوازەکەی ڕەفتاریان دەکرد، دەچوە هەر شوێنێ دەریاندەکرد، خەڵکیان لێ هان دەدا و لەمپەر و بەربەستیان لەسەر ڕێگەی دادەنا و تەنگیان پێهەڵدەچنی.

## ١٢- بەسەرهاتی عیسا لە قورئاندا

پاشان ویستیان بیکوژن و لە کۆڵ خۆیانی بکەنەوە، بەڵام خوا پاراستی و پلانەکەیانی پوکەڵ کردەوە، عیسای بۆ لای خۆی بەرزکردەوە و ڕێزی لێنا، فەرمون بەسەرهاتەکەی لە قورئان بخوێنینەوە: ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾ وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ ۖ قَالَ كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٧﴾ وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾ وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنِّى قَدْ جِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ أَنِّىٓ أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ وَأُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِى بُيُوتِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ۚ وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى

وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾ فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ الْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللَّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللَّهِ آمَنَّا بِاللَّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾ رَبَّنَا آمَنَّا بِمَا أَنزَلْتَ وَاتَّبَعْنَا الرَّسُولَ فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ ﴿٥٤﴾ إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَىٰ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ فَوْقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٥٥﴾ فَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا فَأُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ ﴿٥٦﴾ وَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ﴿٥٧﴾ ذَٰلِكَ نَتْلُوهُ عَلَيْكَ مِنَ الْآيَاتِ وَالذِّكْرِ الْحَكِيمِ ﴿٥٨﴾ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ الْمُمْتَرِينَ[1] واتە: جوبریلی فریشتە بە مەریەمی گوت: مەریەم! خوا موژدەت دەداتێ، کە بە کونفەیەکونێك کوڕێکت پێدەبەخشێ ناوی مەسیحی کوڕی مەریەمە، کوڕەکەت لە دنیا و لە دوایی ڕێز و شکۆیەکی گەورەی دەبێ و لە خواوەش نزیك دەبێ(٤٥). لە ناو بێشکە و بەگەورەیی لەگەڵ خەڵکی دەدوێ و لە ڕیزی چاکەکارانیش دەبێ(٤٦). مەریەم بە سەرسامیەوە گوتی: پەروەردگارا! من ئەگەر هیچ کەسێك توخنم نەکەوتبێ چۆن کوڕم دەبێ! گوتی: کاری خوایە! خوا هەر شتێکی مەبەست بێ پێی دەڵێ ببە دەسبەجێ دەبێ و دێتەدی(٤٧). خوا فێری نوسین و دانایی تەورات و ئینجیلی

---

(١) آل عمران: (٤٥-٦٠).

دەکا(٤٨). دەیکاتە پێغەمبەر و بۆ نەوەی ئیسرائیلی دەنێرێ. پێیان دەڵێ: بێگومان بن من پێغەمبەرم و خوا بەم نیشانە و موعجیزانەوە منی ناردوە: لە قوڕ پەیکەری باڵندەتان بۆ دروست دەکەم پاشان فوێکی تێ دەکەم و دەسبەجێ بە ئیزنی خوا روحی دێتە بەرێ و دەبێتە باڵندەیەکی زندو و هەڵدەفڕێ، هەروەها کوێری زگماك و بەڵەکیش چاك دەکەمەوە و مردوش بە ئیزنی خوا زندو دەکەمەوە، پێشتان دەڵێم کە چتان لە ماڵەوە خواردوە و چشتان وەك زەخیرە هەڵگرتوە، ئەم شتانە هەموی نیشانە و موعجیزەن ئەگەر مرۆی[1] بڕوادار بن(٤٩). هەروەها پێیان دەڵێ: من بەڕاستخەرەوەی تەوراتم و بۆ ئەوە نێردراوم تا هەندێ لەو شتانەی لە تەورات لێتان حەرام کراوە بۆتانی حەلاڵ بکەم، موعجیزەشم لەلای خواوە بۆ هێناون، جا لە خوا بترسن و گوێڕایەڵم بن(٥٠). خوا پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیە، خوا بپەرستن، خواپەرستی ڕاستەڕێیە(٥١).

کاتێك عیسا هەستی کرد بێبڕوایی هەڵدەبژێرن گوتی: کێ پشتیوانی منەو لەسەر ڕێی بانگەوازی خوایە؟ یاوەرە دڵسۆزەکان گوتیان: ئێمە پشتیوانین، شاهێد بن موسڵمانین(٥٢). پەروەردگارا! بڕوامان بە پەیامەکەت هێناوە و وەشوێن پێغەمبەرەکەت کەوتوین، لە ڕیزی ئەوانەمان بنوسە کە بڕواداری یەکخواناسن(٥٣).

پاشان جولەکە بێبڕواکان تەگبیریان کرد و پلانیان کێشا عیسا بکوژن بەلام خوا تەگبیر و پلانەکەی پوچەڵ کردنەوە، بەڕاستی هەر خوا چاکترین تەگبیر گێڕە(٥٤).

---

(١) مرۆ: مرۆڤ.

کاتێك خوا فەرمووی: ئەی عیسا من تا تەمەنی کاملبون لەسەر زەوی دەتهێڵمەوە پاشان بۆ لای خۆم بەرزت دەکەمەوە و لەشەڕ و گەڕی بێبڕواکان رزگارت دەکەم، پاشان وا دەکەم ئەو بڕوادارانەی کە بڕوایان پێهێناوی تا ڕۆژی دوایی هەر بەسەر بێبڕواکان زاڵ بن، پاشان هەموتان بۆ لای من دەگەڕێنەوە و خۆم حوکمتان لە نێوان دەکەم و ڕاست و ناڕاست وەدەردەخەم(٥٥). جا ئەوانەی بێبڕوا بون دەبێ لە دونیا و لە دوایی سزایەکی زۆر سەختیان بدەم و کەسیش نیە فریایان بکەوێ!(٥٦). بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوە و کردەوەی چاکیان ئەنجام داوە پاداشتی خۆیان بەبێ کەم و کوڕی وەردەگرنەوە، هەرگیز خوا ستەمکارانی خۆش ناوێ(٥٧). ئەی پێغەمبەر! ئەو باسوخواسانەی بۆت دەخوێنینەوە هەموی بەڵگەی بەهێز و یادەوەریەکی بەرێوجێی ڕاستن و سەلمێنەری پێغەمبەرایەتی تۆن(٥٨). وەدیهێنانی عیسا لە لای خوا وەك وەدیهێنانی ئادەمە کە ئادەمی لە خۆڵ دروست کرد و پاشان پێی فەرمو ببە، ئەویش دەستبەجێ بو(٥٩). ئەی پێغەمبەر! هەق لەلای پەروەردگارتەوەیە، بۆیە هەرگیز دو دڵ مەبە(٦٠)﴾

## ١٣- ژیان و بانگەوازەکەی لە قورئاندا

ئەم چەند ئایەتە لە قورئان بخوێنینەوە، بزانن خوا چۆن وەسفی ژیان و بانگەوازەکەی عیسا دەکا، دەفەرموێ: ﴿قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا (٣٠) وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا (٣١) وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا (٣٢) وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ

وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا﴾[1] واتە: عیسا گوتی: من بەندەی خوام، خوا ئینجیلی بۆ ناردوم و منی کردۆتە پێغەمبەر. خوا پیرۆزی کردوم لە هەر کوێ بم دەبمە مایەی خێر و خۆشی، هەروەها فەرمانی پێکردوم نوێژ بکەم و زەکات بدەم هەتا ماوم. خوا وایکردوە لەگەڵ دایکم باش بم و چاکەی لەگەڵ بکەم، من کەسێکی خۆهەڵکێش و سەرکێش نیم. سڵاوی خوام لـێبێ لەو ڕۆژەی کە لە دایك دەبم و لەو ڕۆژەی کە دەمرم و لەو ڕۆژەش کە زندو دەکرێمەوە﴾.

## ١٤- ململانێیەکی دێرین

ئەوەی بەسەر پێغەمبەرانی پێشو هات بەسەر پێغەمبەرعیساش هات، سەرۆك و ڕێبەرەکان لـێی دور کەوتنەوە، دەوڵەمەند و بەهێزەکان پشتیان تێکرد، بڕواهێنانیان بە نەنگ[2] و کەموکوڕی دەزانی، پێیان ئەستەم بو سەرۆکایەتی و ڕێبەرایەتی و تازیارێتی[3] و گەورەیی خۆیان لەدەست بدەن، خوا ڕاستی فەرموە کە دەڵـێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ وَقَالُوا۟ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ . [4] واتە: پێغەمبەرمان بۆ هەر گوند و شارێك ناردبێ دەوڵەمەند و دەستڕۆیشتوەکان پێیان گوتون: ئێمە بڕواتان پێناکەین هەروەها گوتویانە: ئێمە ماڵ و منداڵمان زۆرترە توشی سزا و ئەشکەنجە نابین﴾.

---

(١) مریم: (٣٠-٣٣).
(٢) نەنگ: عەیب.
(٣) تازیارێتی: بەسەردا هەبونی، إمتیاز.
(٤) سبأ: (٣٤).

## ١٥- بڕوای خەڵکی هەژار و ڕەمەکی

عیسا لێیان بێهومێد بو بڕوا بێنن چونکە هەر لەسەر بێبڕوایی و لاملی خۆیان مانەوە و لە کەلی شەیتان نەهاتنە خوارەوە، نکۆڵییان[1] لە بەڵگە ڕون و موعجیزە مەزنەکان دەکرد هەرچەندە لە ناخی دڵیش پێیان ڕاست بو، بە سوکی لە عیسایان دەڕوانی چونکە هەژار و بێکەس بو.

بۆیە عیساش ڕوی کردە خەڵکی هەژارو ڕەمەکی، چونکە دڵساف و دەرون پاك بون، چونکە بەڕەنجی سەرشان و ئارەقەی نێوچەوانی خۆیان نانی زگیان پەیدا دەکرد، بە نەژاد و ڕەچەڵەکی خۆیان نەدەنازی، خۆیان بە خزم و کەس و پایەداری هەڵنەدەدایەوە، ئەوەبو چینێکیان بڕوایان پێهێنا کە هەندێکیان جوتیار بون، هەندێکیتریان ماسیگر بون، هەندێکیتریشیان پیشەزان و خاوەن کار بون.

## ١٦- ئێمە لەڕێی خوا یاریدەدەرین

بڕوایان بە مەسیح هێنا و لە دەوری کۆبونەوە، دەستیان خستە ناو دەستی و گوتیان ئێمە لەڕێی خوا یاریدەدەرین. خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾ رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٣﴾﴾[2] واتە: کاتێك عیسا هەستی کرد خەڵکەکە بێبڕوایی هەڵدەبژێرین گوتی: کێ پشتیوانی منە و

---

(١) نکوڵی: ئینکاری.

(٢) ال عمران: (٥٢).

لەسەر ڕێی بانگەوازی خوایە؟ یاوەرە دڵسۆزەکان گوتیان: ئێمە بۆ تۆ پشتیوانین، شاهید بن موسڵمانین. پەروەردگارا! بڕوامان بە پەیامەکەت هێناوە و وەشوێن پێغەمبەرەکەت کەوتوین، لە ڕیزی ئەوانەمان بنوسە کە بڕواداری یەکخواناسن﴾.

## ١٧- گەشت و بانگەواز

پێغەمبەر عیسا زۆربەی کاتەکانی بە گەشت و گەڕان بەسەر دەبرد، بەناو نەوەی ئیسرائیلیەکان دەگەڕا و بۆ لای خوا بانگی دەکردن و گومڕایانی ڕاستەڕێ دەکرد، لەم گەڕان و سوڕانەیدا خۆشی و ناخۆشی دەهاتە ڕێ، لەسەر ناخۆشیەکان ئارامی دەگرت و لە خۆشیەکانیشدا سوپاسی خوای دەکرد، بەرگەی برسیەتی دەگرت و بە بڕە نانی مەمرە و مەژی ڕۆژانی ئاوا دەکرد.

## ١٨- یاوەرەکان داوای خوانێکی ئاسمانی دەکەن

بەڵام یاوەرەکان وەك عیسا ئارامگر نەبون و بەرگەی برسیەتی و کوڵەمەرگی و نەبونییان نەدەگرت، بۆیە داوایان لە عیسا کرد لە خوا بپاڕێتەوە تا خوانێکیان لە ئاسمانێڕا بۆ دابەزێنێ و تێروپڕی لێ بخۆن و برسێتیان بشکێنن.

## ١٩- ئەدەبێکی نابەجێ

لە داواکەیاندا ئەدەبێکی جوانیان نەنواند، بە شێوازێکی نابەجێ گوتیان: (ئایا خواکەت دەتوانێ خوانێکمان بۆ لە ئاسمانێڕا دابەزێنێ؟).

عیسا داواکەی بەدڵ نەبو، ئەو شێوازە نابەجێیەشی پێناخۆش بو.

هەمو پێغەمبەرەکان داوا لە نەتەوەکەیان دەکەن بڕوا بە پەنامەکی[1] بێنن. خۆ موعجیزە ئەوە نیە منداڵ یاری پێبکەن و گەورەش کاتی پێ ڕابوێرن، موعجیزە چەند نیشانەیەکی خوایە و لەو کاتانە لەسەر دەستی پێغەمبەران وەدەردەکەون کە خوا ویستی لەسەربێ، ئەویش تا بیانوی خەڵکی پێببڕێ و ئەگەر بڕواشی پێنەهێنن سزایان دوچار دەبێ.

## ٢٠- ئاگادارکردنەوەی نەتەوەکەی لە سزای سەرەنجام

پێغەمبەر عیسا لەوە ترسا دوای ئەوەی کە موعجیزەکە دەبینن بە گرنگی وەرنەگرن و هەڵوێستی نابەجێ بنوێنن، بۆیە ئاگاداری کردنەوە کە ئەگەر وا بکەن توشی سزایەکی سەخت دەبن. پێی گوتن داوای وا مەکەن، خوا تاقی مەکەنەوە، خوا گەلێك لەوە بەرز و باڵاترە ئێوە تاقی بکەنەوە.

## ٢١- مکوڕبون[2]

بەڵام یاوەرەکان وازیان لە داواکەیان نەهێنا و گوتیان ئێمە زۆر ڕاستینەین[3] و مەبەستیشمان تاقیکردنەوە نیە، بەڵکو دەمانەوێ لە توانای خوا دڵنیا بین و ببێتە یادگاریەك بۆ نەوەکانی داهاتو، ببێتە باسوخواسێك بە درێژایی ڕۆژگار بگێڕدرێتەوە، بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەیەك ڕاستێتی دین و پلەو پایەی بڕوادارانی پێشین و یاوەرە ڕاستخوازەکان وەدەر بخات.

---

(١) پەنامەکی: غەیب.

(٢) مکوڕبون: سوربون.

(٣) زۆر ڕاستینەین: زۆر بە جددیانە.

## ٢٢- قورئان ئەم باسوخواسە دەگێڕێتەوە

با قورئان باسوخواسەکەمان بۆ بگێڕێتەوە: ﴿إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَنْ يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ ۖ قَالَ اتَّقُوا اللَّهَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ (١١٢) قَالُوا نُرِيدُ أَنْ نَأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَنْ قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ الشَّاهِدِينَ (١١٣) قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا أَنْزِلْ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِأَوَّلِنَا وَآخِرِنَا وَآيَةً مِنْكَ ۖ وَارْزُقْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ (١١٤) قَالَ اللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ ۖ فَمَنْ يَكْفُرْ بَعْدُ مِنْكُمْ فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَابًا لَا أُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ﴾[1] واتە: یاوەرەکان گوتیان: ئەی عیسای کوڕی مەریەم پەروەردگارەکەت دەتوانێ خوانێکمان بۆ لە ئاسمانێڕا دابەزێنێ؟ عیسا گوتی: لە خوا بترسن داوای وا مەکەن ئەگەر بڕوادارن. یاوەرەکان گوتیان: مەبەستمان لەم خوانە ئەوەیە کە تێری لێ بخۆین و دڵیشمان ئارخەیان[2] بێ و بشزانین کە تۆ ڕاستت لەگەڵ گوتوین و پێغەمبەری، هەروەها ببینە شاهێدیش لەسەر ئەم ڕوداوە گەورەیە. عیسای کوڕی مەریەم گوتی: پەروەردگارا! خوانێکمان لە ئاسمانێڕا بۆ دابەزێنە تا ڕۆژی دابەزینەکەی بۆ خۆمان و بۆ نەوەکانی داهاتومان ببێتە جەژن، هەروەها ببێتە بەڵگەیەك بۆ گەورەیی دەسەڵاتی تۆ و ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی من، خوایە ئەم خوانەمان پێببەخشە تۆ چاکترین بژێوی بەخشی. خوا فەرموی: من خوانەکەتان بۆ دادەبەزێنم بەڵام پاشان هەر کەسێکتان کافر ببێ دوچاری سزایەکی هێند سەختی دەکەم کە هیچ کەس بەو سەختیە سزا نادەم﴾.

---

(١) المائدة: (١١٢-١١٥).

(٢) ئارخەیان: دڵنیا، مطمئن.

## ٢٣- جولەکەکان دەیانەوێ پێغەمبەر عیسا لە کۆڵ خۆیان بکەنەوە

جولەکەکان ئارامیان لەبەر هەڵگیرا و جامی دوژمنایەتی و لاملێتیان لەسەری ڕژا، ویستیان عیسا لە کۆڵ خۆیان بکەنەوە و لە دەستی ڕزگار بن، سکالایان بۆ لای دادیاری[1] ڕۆمی بەرز کردەوە و گوتیان: ئەم کابرایە پیاوێکی گێرەشێوێن و ئاژاوەگێڕە، لە دینی ئێمە لایداوە و دینەکەی لێ تێکداوین، گەنجەکانی فریو داوە و سەری لێ شێواندون، لێکیکردوین و تێکی بەرداوین، بە سوکی باسی ئاقڵمەند و هۆشمەندەکانمان دەکا و کاروباری لێ تێکداوین.

## ٢٤- شێوازی تۆڵەستێن و سیاسە تمەدارەکان

هەروەها گوتیان: ئەم کابرایە مەترسی لەسەر وڵات هەیە، ملکەچی ڕژێم نابێ، پابەندی یاسا نابێ، گەوران بە گەورە دانانێ، شتی دێرینە بە پیرۆز ناگرێ، پیاوێکی ئاژاوەگێڕ و گێرە شێوێنە، ئەگەر سەرکوت نەکرێ ئەوا بەدی و بەڵاکەی گەورەتر دەبێ، دیارە کە تروسکە ئاگر هەرچەندی کزیش بێ نابێ بە هەوانتە سەیری بکرێ.

## ٢٥- فریودان و چەواشەکاری

وتەکانیان فڕوفێڵ و چەواشەکاریەکی زۆری تێدا بو، دەیانزانی لایەنی دینی کار لە دادیاران ناکا و نایانبزوێنێ، چونکە سیاسەتی دادیارەکان وابو کە پەیوەندییان بە کاروباری جولەکانەوە نەبێ، بۆیە ئەوانیش سیاسەتیان لەگەڵ وتەکان تێکەڵ کرد.

---

(١) دادیار: حاکم.

## ٢٦- گیروگرفت

زۆر زەحمەت بو دادیارە هاوبەشپەرستە بێگانەکان بتـوانن لـە ڕاسـتەقینەی سکاڵاکە بکۆڵنەوە و بزانن مەبەستی جولەکەکان لەمە چـیە و بۆچـی دژایـەتی مەسیح دەکەن، چونکە زۆر بە کاروباری کارگێڕی سەرقاڵ بون.

جولەکەکانیش گەلێك بە چەلومل[1] بون و کێشە و سەرێشەیان نەدەبڕیەوە و لەناو خەڵك باس هەر باسی ئەم مەسەلەیە بو، لەبەر ئەوە دادیارەکان ویـستیان کۆتایی بە کێشەکە بێنن و بیبڕێننەوە.

## ٢٧- پێغەمبەر مەسیح لەناو دادگەدا

دادگاکردنەکە لە دوای عەسری ڕۆژی هـەینی یـان لـە شـەوی شـەممەدا بـو، جولەکەکان باویان وابو ڕۆژی شەممەیان کردبوە ڕۆژی پشودان و کاریان نـەدەکرد، بۆیە لەسەر ئەوە مکوڕ بون کە بـەر لـەوەی خـۆری هـەینی ئـاوا بـێ حـوکمی دادگاکە دەربچێ، تا لەدەست پێغەمبەر مەسیح ڕزگار بـن و شـەو بـە ئـارامی لـێی بنون و بحەسێنەوە، بۆ بەیانیش بەوپەڕی مورتاحیەوە لەخەو هەڵسن و چیتر خەفەت نەخۆنەوە.

دادیارەکە[2] زۆر بەم کێشەیە نیگەران بو، حەزی نەدەکرد لە مەسەلەیەکی وا حـوکم دەرکـا، هـیچ بەرژەوەندیەکیـشی بـۆ گەلەکـەی تێـدا وەدی نـەدەکرد. جولەکەکانیش هەمو کۆ ببونەوە تا بزانن دادیـار چ حوکمێـك ڕۆ دەنـێ، هـەبو قسەی ناشیرینی پێدەگوت، هەبو توانج و تەشەری تێدەگرت، دادیارەکە نابەدڵ و

---

(١) چەلومل: وازنەهێنێکی جاڕسکەر.
(٢) دادیار: حاکم.

تەنگەتاو ببو، کاتەکەش کاتێکی کورت بو، خۆر خەریکبو ئاوا دەبو، دادیار حوکمەکەی دەرکرد و گوتی: دەبێ لە خاچ هەڵواسرێ و بکوژرێ.

## ٢٨- یاساکانی تاوانکاری لەو سەردەمدا

یاساکانی تاوانکاری ئەو سەردەم وای لەسەر حوکمدراوەکە پێویست دەکرد ئەو خاچە هەڵگرێ کە لەسەری هەڵدەواسرێ، سێدارەکە لە شار دور بو وەك چۆن لە وڵاتە شارستانەکانیش وا باوە دور بێ، هەزارەزیلەی خەڵکەکە هێند قەرەباڵغ بو دەرزی بە ئەرزی نەدەکەوت، جەندرمەکان کە زۆربەیان بێگانە بون فەرمانبەری فەرمان پێکراو بون و کەسیان بۆ کێشەکە گەرموگوڕ نەبون، ئیسرائیلیەکانیان لەبەرچاودا زۆر بە یەکتر دەچو و ئەم و ئەویان زۆر باش بۆ نەدەناسرایەوە، هەڵبەت هەمو گەلێکی بێگانە لەبەر چاوی پیاودا ئاوا بە یەکتر دەچن. کاتەکەش دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ بو تاریکی لە بولێڵە[1] دابو، هەندێك لە جولەکە گەنجە خوێنگەرمە گەمژەکان هەڵدەرژانە سەر پێغەمبەر مەسیح و پاڵیان پێوە دەنا و جوێنیان پێدەدا و دەیانویست ئازاری پێبگەیەنن و ڕوشکێنی بکەن.

## ٢٩- عیسا ئازارێکی زۆر دەچێژێ

پێغەمبەر مەسیح زۆر شەکەت و ماندو ببو، هێز و بڕستی بڕابو، لە دادگادا هەر بە پێوە وەستا بو، خاچەکەش زۆر قورس بو، فەرمانیشی پێکرابو هەڵیبگرێ، زۆر پەرێشان ببو و نەیدەتوانی لە ڕێگەدا بە خێرایی بڕوا.

---

(١) بولێڵە: تاریك و ڕونی ئێواران و بەیانیان.

## ٣٠- تەگبیرێکی خودایی

لێرەدا ئەو جەندرمانەی کە عیسایان پێسپێردرا بو فەرمانیان بـە گـەنجێکی جولەکە کرد خاچەکە هەڵبگرێ تا بەڵکو کارەکە بە خێرایـی کۆتـایی پێبێـت و لەو ئەرکە قورسە ڕزگار بن, گەنجەکە لە هەمو برادەرەکانی خۆی هیـچوپوچتر و بەگەف و گورڕتر بو، لە هەموان پتر ئازاری پێغەمبەر عیسای دەدا.

## ٣١- لێیان گۆڕا

بـەمجۆرە کـاروان گەیـشتە بـەر دەروازەی سـێدارە، جەندرمەیـەك هـات فەرمانەکەی لە جەندرمەکانی شـاری وەرگـرت و دیتیـان وا لـەملاوە گـەنجێك ڕاوەستاوە و خاچێکی هەڵگرتوە، ئا لێرەدا لێیان شێوا و هەراوزەنا بـەرز بـۆوە. قۆڵـی گەنجەکەیان گرت و ڕاپێچیان کرد، ئەوان گومانیان لەوە نەبو کە گەنجەکە حوکمدراوەکەیە چونکە ئەو خاچەکەی هـەڵگرتبو، گەنجەکـە هـاواری دەکـرد و دەیزیڕاند، دەیگوت: ئەی هاوار! خۆ من حوکمکراوەکە نیم، من پەیوەنـدیم بـە حوکم و سێدارەوە نیە! من بە زۆری زۆردارەکی خاچەکەیان پێهەڵگرتوم!، بـەڵام جەندرمەکانی لە سێدارەدان گوێیان بەم قسانە نەدا و لە قسەکانیشی نەدەگیشتن چـــونکە ڕۆمانی و یۆنانی بون.

## ٣٢- جێبەجێکردنی حوکمەکە

هەمو تاوانکارێك خۆی بە بێتاوان دەردەخـا و دەڵـێ مـن بێتـاوانم، هـەمو تاوانکارێك کە بەرەو سزا دەبردرێ هاوار و فیغان دەکا. گەنجەکەیان ڕاپێچ کرد و

حوکمەکەیان جێبەجێ کرد، جولەکەکان لە دورەوە وەستا بون و دونیاش ئێـوارە بو، تاریك بو، وایاندەزانی ئەو کەسەی وا لە خاچ دراوە پێغەمبەر مەسیحە.[1]

## ٣٣- بەرزکردنەوەی عیسا بەرەو ئاسمان

خوای گەورە پێغەمبەر عیـسای کـوڕی مەریەمیـشی لـە پـلان و فڕوفێڵـی جولەکەکان ڕزگار کرد و بە ڕێزێکی زۆرەوە بەرەو ئاسمانێی بەرز کردەوە.

## ٣٤- قورئان لەبارەی ئەم بەسەرهاتەوە دەدوێ

خوا لە قورئاندا کە لە بارەی جولەکەکانەوە دەدوێ باسی ئەم بەسەرهاتەش دەکات و، دەفەرموێ:﴿ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَانًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا اتِّبَاعَ الظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾[2] واتە: جولەکەکان بڕوایان بە عیسا نەکرد و بوختانێکی گەورەشیان بە مەریەم هەڵبەستا، هەروەها گوتیان: مەسیحی کوڕی مەریەمیشمان کوشت، بەڵام عیسا پێغەمبەری خوا بو و نەشیانکوشت و لەخاچیشیان نەدا، بەڵکو یەکێکی تریان کوشت و بە عیسای تێگەیشتن، ئەو کەسانەش کە ڕای جیاوازیان لە کوشتنی عیسا هەبو گومانیان لە کوشتنەکەی هەبو چونکە هەر بە گومان و مەزندەوە پێیانوابو عیسایە و

(١) لە وردەکاری و کەینوبەین و کەشوهەوای ئەم سەربردەیەدا متمانـەمان کردۆتـە سـەر بەڵگەنامە مێژویی و یاساییە مەسیحیەکان کە لەم دواییەدا دۆزرانەوە و نوسراونەتەوە.

(٢) النساء: (١٥٦-١٥٨)

یەقینیان نەبو، عیسایان نەکوشتوە بەڵکو خوا بەرزی کردۆتەوە ئاسمانێ، خوا بە دەسەڵات و دانایە﴾.

ئێستا عیسا لە ئاسمانێ دایە، خوا خۆی پێی ئاگادارە، خوا دەتوانێ هەمو شتێ بکا.

پێغەمبەر عیسا لەدایکبون و ژیان و کاروبارەکانی سەیروسەمەر و یاسابەدەر بو، هەموش هێز و توانی بێسنوری خوایان نیشان دەدا.

## ٣٥- دابەزینی عیسا بەر لە رۆژی دوایی

هەر کاتی خوا مەبەستی بێ عیسا لە ئاسمان دادەبەزێنێ، بیانوی جولەکە و گاوران دەبڕێ، هەق سەردەخا و ئەهلی ناهەق دادەمرکێنێ. پێغەمبەرﷺ لە رێی فەرمودە ڕاست و موتەواتیرەکانیەوە ئەو هەواڵەی پێڕاگەیاندوین و موسڵمانانی هەمو سەردەمێکیش بڕوایان پێهێناوە، خواش ڕاستی فەرموە کە دەڵێ: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾[1] واتە: هەمو خاوەن نامەکان بڕوا بە عیسا دێنن پێشئەوەی بمرێ، لە ڕۆژی دواییشدا دەبێتە شاهید لەسەریان﴾.

## ٣٦- موژدەکەی عیسا بە ناردنی پێغەمبەرمان محمدﷺ

پێغەمبەر عیسا لەبەر ئەوەی جولەکەکان دژایەتیەکی توندوتیژیان دەکردو پلان و فرِوفێلیان بۆ دادەنایەوە و بێدەسەڵات و بێ پشت و پەنا بو؛ نەیدەتوانی بانگەوازەکەی بە ئاکام بگەیەنێ. ماڵئاوایی لە خەڵك کرد و فەرمانی خوای

---

(١) النساء: ١٥٩.

جێبەجێ کرد، موژدەشی بە خەڵکەکە دا کە لەدوای خۆی پێغەمبەرێك دێ کارەکەی تەواو دەکا و بانگەوازەکەی فرەوان دەکا، خوا بە هۆی ئەو پێغەمبەرەوە نیعمەتی خۆی بەسەر مرۆڤایەتی تەواو دەکا و خەڵك بیانویان نامێنێ، خوا لە قورئان دەفەرموێ:﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ﴾[1] واتە: عیسای کوڕی مەریەم گوتی: خەڵکینە من پێغەمبەری خوام و بۆ ئێوە نێردراوم، تەورات بەڕاست دەخەمەوە و موژدەتان پێدەدەم کە لە دوای من پێغەمبەرێك دێ ناوی ئەحمەدە﴾.

## ٣٧-لە یەکخواناسیەکی پاکەوە بەرەو بیروباوەڕێکی ناڕون

یەکێك لە شتە سەیر و سەمەرەکانی مێژو کە چاو فرمێسکی بۆ هەڵدەڕێژێ و دڵ بۆی دەتاوێتەوە ئەوەیە کە بانگەوازەکەی پێغەمبەر عیسا کە بۆ یەکخواناسیەکی پاك و بێگەرد و ئاینێکی ئاسان و سادەی دور لە ئاڵۆز و لێڵی و دەستکاری و واتاگۆڕی و بۆ خواپەرستی و داوا لە خوا کردن و هانا بردن بەرەو لای خوا و خۆشویستنی خوا، خەڵکی بانگ دەکرد، گۆڕا بۆ بیروباوەڕێکی ناڕون و لێڵ و بۆ فەلسەفەیەکی ئاڵۆز و پڕ گرێوگاڵ، شوێنکەوتوەکان زێدەڕۆییان کرد و هێند پێدا ڕۆیشتن تا ئەوەی سنوری مرۆڤێتیان بەزاند و پەڕینەوە ناو سنوری خواوەندێتی، گەیشتە ڕاددەیەك بڵێن: (مەسیح کوڕی خوایە)، (خوا کوڕی هەیە)، (مەسیحی کوڕی مەریەم خوایە).

خوا کە تاك و تەنیایە و لە کەس نەبوە و کەسیشی لێ نابێ؛ کردبویانە

(١) الصف: ٦

خێزانێکی سێ کەسی و هەرسێکیان بە خوا دادەنا، دەیانگوت: باوك و کوڕ و گیانی پیرۆز.

بیروباوەڕ و ڕەفتاریان لەبارەی مەریەمی دایکی مەسیح گەیشتە ڕادەیەك بە پیرۆزی بزانن و بیپەرستن، پێیان دەگوت: (دایکی خوا)، لەناو هەمو کەنیسەکانیشدا پەیکەریان بۆ داتاشیبو و وێنەیان بۆ هەڵواسیبو، گاورەکان لە کاتی تەنگانەدا پەنایان وەبەر دەبرد و لێی دەپاڕانەوە، قوربانیان بۆ سەردەبڕی و کڕنوشیان بۆ دەبرد.

خوا بە نارەزاییەوە لەبارەی بیروباوەڕەکەیانەوە دەدوێ و ڕەفتارەکەیان بە خراپەیەکی ناقۆلا، دەفەرموێ: ﴿مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٞۖ كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرۡ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ۝٧٥ قُلۡ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗاۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ (١) واتە: مەسیحی کوڕی مەریەم پێغەمبەر بوە و بەر لەویش گەلێ پێغەمبەریتر ناردراون، دایکەکەی ڕاستخواز بوە، وەك مرۆڤانیتر نان و خواردنیان خواردوە، ڕامێنە بزانە چۆن نیشانەکانیان بۆ ڕون دەکەینەوە، دیسان ڕامێنە بزانە ئەوان چۆن ڕو لە ڕاستی وەردەگێڕن. پێیان بڵێ: ئایا جگە لە خوا کەسێکیتر دەپەرستن کە نەدەتوانێ زیانتان لێبدات و نە قازانجتان پێببەخشێ؟ کە خوای گەورەش بیسەر و زانایە﴾.

---

(١) المائدة: (٧٥).

## ٣٨- عیسا بانگی خەڵك دەكا تا بەتەنها خوا بپەرستن

پێغەمبەر عیساش وەكو سەرجەم پێغەمبەرەكانیتر بانگی خەڵكی كردوە تا خوای تاك و تەنیا بپەرستن، لە ئینجیلدا هاتوە دەڵێ: (مافی خوایە كە سوژدەی بۆ ببەی و بەتەنیا ئەو بپەرستی)[١]، هەروەها وتە كە دەڵێ: (مافی خوایـە كـە سوژدەی بۆ ببەی و بە تەنیا ئەو بپەرستی).[٢]

خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ اللَّهُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا عِبَادًا لِّي مِن دُونِ اللَّهِ وَلَٰكِن كُونُوا رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا الْمَلَائِكَةَ وَالنَّبِيِّينَ أَرْبَابًا ۗ أَيَأْمُرُكُم بِالْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾[٣] واتە: هەر مرۆڤێك كە خوا پەرتوك و دانایی و پێغەمبەرایەتی داوەتێ بۆی نەبوە بە خەڵك بڵێ: وەرن من بپەرستن و خوا مەپەرستن، بەڵكو پێیان دەڵێ: وەرن بەو جۆرە پەروەردگار بپەرستن كە لە پەرتوك فێركراون و خوێندوتانە. فەرمانیشتان پـێناكا فریشتە و پێغەمبەران بكەن بەخوا، هەرگیز فەرمانتان پێناكا بێبڕوایی بكەن دوای ئەوەی كە بونە موسڵمان﴾.

---

(١) مەتتی(٤:١٠)

(٢) لۆقا(٤:١٠)

(٣) آل عمران: (٧٩-٨٠).

## ٣٩- قورئان بانگەوازەکەی عیسا دەخاتە ڕو

قورئان کە بەڕاستخەرەوەی دینەکانی پێشوە و زاڵیشە بەسەریاندا بە نەشم و شێوازێکی ڕاست و ڕەوان و بێ کەم و زیاد باسی ئەوە دەکات کە پێغەمبەر عیسا بانگەوازی یەکخواناسی ڕاگەیاندوە: ﴿ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴾.[1] واتە: ئەو کەسانەی کە گوتیان مەسیحی کوڕی مەریەم کوڕی خوایە بێبڕواییان کردوە، مەسیح گوتویەتی: ئەی نەوەی ئیسرائیل! خوا بپەرستن کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیە، بزانن هەر کەسێك هاوبەش بۆ خوا پەیدا بکا؛ خوا بەهەشتی لێ حەرام کردوە و دەچێتە ناو ئاگر و کەسیش نیە رزگاری بکا﴾.

## ٤٠- شوێنپایەی یەکخواناسی لە بانگەوازەکەیدا

قورئانی پیرۆز بە نەشم و شێوازێکی زۆر بەتام وچێژ و ڕەوانبێژانەوە باسی شوێنپایەی یەکخواناسی دەکا لە بانگەوازەکەی پێغەمبەر عیسادا. هەرکەسێ لە یەکخواناسی و لە ژیانی پێغەمبەر و پەیامبەران شارەزا بێ و، خوای گەورە بناسێ و فەرمانەکانی جێبەجێ کردبێ و ترسی خوای لە دڵ بێ، لەم ئایەتە بۆی دەردەکەوێ کە پێغەمبەر مەسیح چەند بە پاکی بانگەوازی یەکخواناسی ڕاگەیاندوە: ﴿ لَّن يَسْتَنكِفَ ٱلْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ وَلَا ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ

---

(١) المائدة: (٧٢).

ٱلْمُقَرَّبُونَۚ وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا ﴿١٧٢﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْتَنكَفُوا۟ وَٱسْتَكْبَرُوا۟ فَيُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾[1] واتە: نە مەسیح و نە فریشتە نزیکەکانیش خۆیان بە گەورە نەزانیوە تا نەبن بە بەندەی خوا، هەر کەسێ خۆی بە گەورە بزانێ و خوا نەپەرستێ. ئەوا لە ڕۆژی دوایی هەمو بۆ لای خوا کۆدەکرێنەوە. جا ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و کردەوەی چاکیان ئەنجام داوە پاداشتێکی سەروبەر وەردەگرنەوە و خوا لە چاکەی خۆی شتی زیاتریشان پێدەبەخشێ، بەڵام ئەوانەی کە خۆیان بە گەورە زانیوە و لوتبەرزییان نواندوە سزایەکی سەختیان دەداتێ. جگە لە خواش کەس نیە یارمەتیدەر و پشتیوانیان بێ﴾.

## ٤١- دیمەنێکی سەرنجڕاکێش لە دیمەنەکانی ڕۆژی دوایی

قورئانی پیرۆز بە زمانە پاراو و پەرجوەکەیەوە[2] دیمەنێك لە دیمەنە سەرنجڕاکێشەکانی ڕۆژی دوایی دەخاتە بەرچاو کە تێیدا پێغەمبەر عیسا خۆی لەم قسانەی پێیان هەڵبەستاوە و لەو کردەوە نابەجێیانەی لە ئاستیدا کردویانە بێبەری دەکات، هەروەها بانگەوازەکەی بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە دەخاتە ڕو، ئەوانیش خەتابار دەکا و لەو تاوانە بە بەرپرسیان لە قەڵەم دەدا کە عیسایان لە

(١) النساء: (١٧٢-١٧٣).

(٢) پەرجو: معجزە.

ڕادەی مرۆڤێتی بردۆتە دەرەوە. قورئان بخوێننەوە و لە شان و شکۆ و سام و هەیبەتی ئەم دیمەنە ڕامێنن کە دەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١١٥﴾ وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلۡتُ لَهُمۡ إِلَّا مَآ أَمَرۡتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۚ وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١٩﴾ لِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا فِيهِنَّۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرُۢ﴾ (١) واتە: لەڕۆژی دوایی خوا بە عیسای کوڕی مەریەم دەڵێ: عیسا تۆ بەخەڵکیت گوتوە: جگە لە خوا من و دایکیشم بکەن بە خوا، عیسا دەڵێ: پاکی بۆ تۆ خوایە! من بۆم نیە شتێکی ناشایستە دەرهەق بە تۆ بلێم، ئەگەر وام گوتبێ تۆ زانیوتە، چونکە تۆ دەزانی لە دەرونی مندا چ هەیە، بەڵام من نازانم لە دەرونی تۆدا چ هەیە، تۆ بە پەنامەکی زانیاری(١١٦). خوایە من هەر ئەوەم پێگوتون کە تۆ فەرمانت پێکردوم، پێمگوتون: خوا بپەرستن کە پەروەدگاری من و پەروەردگاری ئێوەیە، تا منیش لە ناویاندا بوم لە حاڵیان ئاگادار بوم بەڵام کە

(١) المائدة: (١١٦-١٢٠).

تۆ منت بۆ ئاسمانێ بەرز کردەوە خۆت چاودێریان بوی، خۆت بە هەمو شتێك ئاگاداری خوایە!(١١٧) ئەگەر سزایان بدەی ئەوا بەندەی خۆتن، ئەگەر لێشیان خۆش بی ئەوا هەر خۆت بە دەسەڵات و دانای،(١١٨) ئەوجا خوا دەفەرموێ: ئەمڕۆ ڕۆژێکە تەنها ڕاستگۆکان بەهرەمەند دەبن و بەهەشت و باخاتێکی زۆریان پێدەبەخشم کە چەندین ڕوباریان بە بەردا دەڕوات و بۆ هەمیشە لەناویدا دەبن، خوا لەو کەسانە ڕازی بوە و ئەوانیش لە خوا ڕازین، ئەمەشە سەرکەوتنی گەورە.(١١٩) موڵکی ئەرز و ئاسمانەکان و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە هی خوایە، خوا توانای بەسەر هەمو شتێکا هەیە(١٢٠)﴾.

## ٤٢- لە بیروباوەڕێکی لێڵەوە بەرەو بتپەرستیەکی بەربڵاو

بانگخوازە مەسیحیەکان لە خۆڕا[1] چونە ئەوروپا، کە ئەوروپا لە مێژ بو بتپەرستیەکی لە ڕاددەبەردەری لەناودا بڵاوببوەوە و تا گەردنانی تێدا نغرۆ ببو.

یۆنانیەکان بتپەرست بون، سیفەتەکانی خوایان لە چەندین پەیکەری جۆراوجۆری خواوەندان بەرجەستە کردبو، گەلێك کۆتەڵیان[2] بۆ داتاشی بون، گەلێك پەرستگایان بۆ بنیات نابون، بۆ بژێوی خواوەندێك و بۆ بەزەیی خواوەندێك و بۆ زەبروزەنگ و زاڵی خواوەندێکیان دانابو.

(ڕۆما)ش بتپەرستی لەگەڵ گۆشت و خوێنی تێکەڵ ببو، لەگەڵ ڕوح و خوێنی هاموشۆی بو، ڕۆمانیەکان گەلێ جۆرە خواوەندیان دەپەرست. جا کاتێك کە

---

(١) چونکە مەسیح فەرمانی پێنەکردبون، بەڕاشکاویش گوتویەتی من بۆ مەڕە وێڵەکانی نەوەی ئیسرائیل ناردراوم.
(٢) کۆتەڵ: پەیکەر.

ئاینی نەسرانییان گەیشتێ، قوستەنتینی گەورە لەساڵی ٣٠٦ زایندا بوە نەسرانی و ئاینی نوێی لە ئامێز گرت و کردیە دینی ڕەسمی وڵات.

لەوێدا نەسرانیەت گەلێ بیروباوەڕی بتپەرستی و نەریتی ڕۆمانی و فەلسەفەی یۆنانی وەرگرت، بەرەبەرە لەگەڵیان تێکەڵ دەبو، تا وای لێهات ڕەسەنایەتی پێغەمبەرانە و سادەیی ڕۆژهەلاتانە و گوڕ و تینی یەکخواناسانەی خۆی ون کرد، چەندین دوڕویش تێیوەرهاتن، ئەوانیش گەلێك بیروباوەڕی کۆن و چەشەی[1] بتپەرستانەیان تێخست، لە ئەنجامی ئەمەدا دینێکی تری تازەی لێ پەیدا بو کە نەسرانیەت و بتپەرستێتی تێدا وەکو یەك بون.

بەجۆرە نەسرانیەت بە ڕێگایەکی تری غەیری ڕێگاکەی مەسیح بلاو دەبۆوە و بانگەوازی بۆ دەکرا. وەك ڕێبوارێکی ڕێ بزربو کە بە ئەنقەست و بە نەزانینەوە ملی ڕێگایان بگرێ بێئەوەی ڕیگەی یەکەم و ڕێگەی کۆتایی پێك بگاتەوە.

لەبەر ئەم حیکمەتە کە تەنها ئەوانەی مێژوی ئەم ئاینەیان خوێندۆتەوە لێی تێدەگەن؛ خوا ئەم نەتەوەیەی بە گومڕا ناوزەد کردوە، بەلام جولەکەکانیش بە نەتەوەیەکی غەزەب لێگیراو. لەسەر زاری موسڵمانانەوە دەفەرموێ: ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾[2] واتە: خوایە! بۆ ڕێی ڕاست ڕێنوێنیمان بکە، ڕێگەی ئەو کەسانەی میهرەبانیت لەگەڵدا نواندون، نەوەك ڕێگەی ئەو کەسانەی کە وەبەر توڕەیی کەوتون، ئەوانەش نا کە گومڕا بون﴾.

---

(١) چەشە: چێژ.

(٢) الفاتحة

بێگومان ئەمە بوە هۆی نانەوەی مەرگەسات[1] لە ئەوروپادا، بگرە بوە هۆی ئەوەی کە تەواوی مرڤایەتی دوچاری مەرگەسات ببێ کە ئەوروپا ڕۆژگارێکە سەرکردایەتی دەکا و تا ئێستاش جڵەوی سەرکردایەتیەکەی لەدەست دایە و بەسەر جیهان قەڵەمڕەوە[2]. بەڵام سەرەتا و کۆتایی کاروبار هەر لە دەست خوایە.

(١) مەرگەسات: کارەساتی دڵتەزێن.

(٢) قەڵەمڕەو: حاکم.

# فەرهەنگۆك

ئاتـــــاج: موحتاج.
ئارخـــــەیان: دڵنیا، مطمئن.
ئـــــارو: خەیار.
ئـــــازیز: زۆر خۆشەویست
ئاســـــتانە: دەربار و بەر دیوەخانی پاشایان.
ئاســـــەوار: شوێنەوار.
ئاکـــــار: سیفەت.
ئـــــامۆژ: تعالیم.
ئـــــاوەز: عەقڵ، عەقڵیەت.
ئـــــاوزا: هاوتەمەن.
ئـــــاوس: ئاژەڵی زگپڕ.
ئاوهـــــەڵگۆزین: ئاو دەرهێنان لەبیر.
ئـــــاوێزان: خۆ دەئامێزدان.
ئەســـــپایی: لەسەرخۆیی.
ئـــــەفرێنراو: خولقێنراو، وەدیهێنراو.
ئەفـــــسوس: ئەسەف. داخ و خەم.
ئەوێنـــــدەر: ئەوێ، ئەو شوێن.
بـــــاك: منەت.
بـــــان: سەر.
بـــــاو: عادەت.
بـــــاوەش: ئامێز.
بـــــە پەلـــــەپروزێ: بە پەلەپەل.
بـــــە هەڵـــــەداوان: بەتاڵوکە، بە پەلەپەل.
بەرەنگاربونـــــەوە: روبەڕویونەوە.
بەشـــــکو: بەڵکو، خۆزگە وادەبو.
بەڵـــــەد: شارەزا.
بـــــەهرە: نیعمەت، بەخشش.
بـــــەهرەداری: نیعمەتداری.
بـــــەیان: بەیانی.
بـــــزر: ون
بوغرابـــــون: مەغروربون.
بولێلـــــە: تاریك و ڕونی ئێواران و بەیانیان.
بـــــوێر: بەجەرگ و چاونەترس.

بێبـــــــــەری: نابەژدار.
بێدەرامـــــــەت: بێداهات.
بێـــــــــسۆ: بێگومان، بێشك.
بێگـــــــاری: کاری بە زۆری و بێ کرێ.
تۆمـــــــانج: بوختان.
تـــا ســـەر تـــرە: هەمیشە ترە.
تازیـــــــارێتی: بەسەردا هەبون، ئیمتیاز.
تاســـــــــە: شەوق، حەزرەت.
تاســـــــەر: تا هەتایە.
تاوەنگـــــــاز: بەتاوی ڕۆژ سوتاندن.
تەخـــشان و پەخـــشان: بە فیڕۆدان، پاکوپوك کردن.
تــــــەفروتونابون: لەناچون و کاولبون.
تــــــــەلار: باڵاخانە.
تــــەمبێ بــــون: دەست لە کاری ناڕەوا هەڵگرتن بەهۆی سزایەك.
تــــــەوازۆ: پۆزش، عوزر.
تــــــــوانج: تانە و تەشەر.
تێهەڵـــــچونەوە: سەرلەنوێ قسەلێکردنەوە.
پاســــــــاو: هۆی عوزرئامێز.
پاکیگـــــــاری: گوتنی سبحان الله.
پــــــــەرجو: معجزە.
پــــــــەروا: ترس.
پەنامـــــــەکی: غەیب.
پیاومــــــــاقوڵ: پیاوی دیار و دەمڕاست.
پێـــــــشبین: کاهین، ئەو کەسەی شتێك پێشبینی دەکات بۆ داهاتو.
پێهـــــــەڵگوتن: مەدحکردن.
جــــــــەردەیی: ڕێگری.
جگەرگۆشـــــــە: منداڵ.
حەشـــــــاردان: شاردنەوە.
خۆدانوســـــاندن: ڕەوینەوە، ساردبونەوە لە شتێك.
خــــــــامۆش: کپ، بێ هەست و خوست.
خەملانـــــــدن: تەقدیرکردن.
خـــــــــەمین: خەمگین، خەفەتاوی.
دۆش دامـــــــان: حەیران بون.
داخورپـــــــاو: لەرزەی لە ناکاوی دڵ.
دادی نـــــــەدان: سودی پێ نەگەیاندن.
دادیــــــــار: حاکم.

داغ کـــــــردن: سۆرکردنەوە.
داڵ: باڵندەیەکی گەورەی مردار خۆرە.
دامـــــــەن: داوێن، دامێن.
دایـــــــەن: ئەو ژنەی کە شیر بە منداڵان دەدا.
دەبـــــــورێ: خۆش دەبێ.
دەراســـــــا: کاری لە عادەت بەدەر.
دەرەتـــــــان: رێی رزگاری.
دەرەقـــــــەت: دەروەست.
دەرهـــــــەق: لەمەڕ، بەرامبەر بە.
دەروەســـــــت: دەرەقەت.
دلۆڤـــــــان: دڵنەرم و بە بەزەیی.
دوارۆژ: رۆژی دوایی.
دیـــــــدەن: دیدار، دیتن.
دیـــــــدەوان: چاودێر.
دیـــــــدەوانی: چاودێری.
ژیـــــــوان: پەشیمان، گەڕانەوە بۆ لای خوا.
ژیـــوان بونـــەوە: پەشیمان بونەوە.
ڕاداشـــــــتن: ئاماژەکردن.
ڕادەبـــــــوری: ڕەت دەبو، تێدەپەڕی.
ڕاژەکـــــــار: خزمەتکار.
ڕاڕایـــــــی: دودڵی.
ڕاســـــــتینە: بەجددی.
راســـــــپاردە: ئەمانەت.
ڕاچـــــــەنی: ڕاجفری.
ڕام: دەستەمۆ.
ڕەخـــــــسی: هەراش بو، لە خەم دەرچو، گەورە بو.
ڕەزیـــــــل: خنس، ڕژد.
رەمەکیانـــــــە: بەبێ پیلان و بەرنامە، عەشوائی.
ڕەوا: هەق.
ڕەواز: ڕێگایەك هاتوچۆی لەسەر بێ.
ڕەوش: حاڵ و بار، وەزع.
ڕك: قین.
ڕواڵـــــــەت: دیمەنی دەرەوەی شت.
ڕوشـــکێن کـــردن: قسەی سارد پێگوتن.
ڕێـــــــژین: سەربردە، ژینی ڕابردوی کەسێك.
ڕێزانـــــــە: ڕێز لێنان.

زۆر راستینەین: زۆر بە جدیانە.
زاری : شیوەن و گریانی تازیەداری.
زەرەر: زیان.
زەندۆڵ: قەڵشی زل لە زەویدا.
زەین: بیروهۆش.
زگوزا: لەدایکبونی منداڵان.
سۆراخ: بەدواداگەڕان. لێکۆڵینەوە.
سبەینان: بەیانیان.
سەرسەخت: سەرکێش.
سەرگەردان: وێڵ، رێ لەبەربزربو.
سەرقاڵ: مەشغول.
سەرکۆنە: گلەیی، سەرزەنشت.
سەقامگیر: جێگیر و چەسپ.
سپڵەیی: بێنەمەکی، پێنەزانین.
سرشت: تەبیعات، سروشت.
سروش: نیگا، وەحی.
سڵەمینەوە: ڕەوینەوە، ساردبونەوە لە شتێك.
سینە: سینگ.
شەڕەنگێز: خراپەویست.
شەلاقە: جۆرە باڵندەیەکە.
شمەك: شتومەك.
شون: شوێنەوار، شوێنپێ.
چاوبەستی بون: شت نەدیتن.
چەشە: چێژ.
چەلومل: وازنەهێنێکی جاڕسکەر.
گۆلك: گوێرەکە.
گاسکردن: بانگکردن.
گاشەبەرد: بەردی زل.
گاگەل: کۆمەڵێك گا.
گەنجۆ: ئەی گەنج.
گەوج: بێعەقڵ.
گرفتاری: بەلا بەسەرداهاتن.
گزی: خیانەت.
گوێڕادێر: گوێبیست.
گیر نەبو: نەسرەوی.
عەرەق: مەی.

عەوداڵ: شەیدا.
فەرمایشت: فەرمان، ئەمر.
فرەیی: زۆری.
فریادڕەس: ڕزگارکەر.
فریشتەی مەرگوان: فریشتەی گیانکێش.
فریو خواردن: خەڵەتان.
فیرعەونەکان: پاشاکانی میسر.
قەپات دەبن: دادەخرێن.
قەلاچۆ: بنبڕکردن، لەناوبردن.
قەڵەمڕەو: حاکم.
قوتار: ڕزگار، دەرباز.
قوڕبەسەر: بێچارە.
کۆتەڵ: پەیکەر.
کۆس کەوتن: توشی تەنگانەبون.
کەساس: خاکەسەر.
کەشوفش: لاف و تەنتەنە.
کەنەفتی: پەککەوتەیی.
کەنگێ: کەی، چ کاتێ.
کەوش: نەعل.
کوڕیژگە: کوڕی بچکۆڵە.
کوشتنەوە: سەربڕین.
کێشە: ناکۆکیەك، قچیە.
لاقرتێ: گەمە و گاڵتە.
لامل: سەرسەخت، ڕکەگر، عیناد.
لاواندنەوە: دەسبەسەرداهێنان، دڵدانەوە.
لە پای: لە بری، لە بەرامبەر.
لە کوڵ بونەوە: لەناو چون.
لەباتی: لەجیاتی.
لەخشین: خزین.
لوتبەرز: خۆ بەگەورەزان، فیزبەرز.
لێکی کردن: لە یەکتری دابڕاندن.
لێم خۆش بوە: لێی بوریوم.
مۆڵگە: جێی حەوانەوەی وشتر و مەڕوماڵات.
مەحاڵ: ئەستەمە، مستحیل.
مەحکەم: قایم و توندوتۆڵ.
مەرگەسات: کارەساتی دڵتەزێن.

مـــــــــــەزن: گەورە.
مەزنـــــــــدە: خەملاندن بە مێشك.
مەنـــــــــــد: سەنگین.
مەهانـــــــــە: بەهانە، بڕوبیانو.
مــــــــەیگێڕ: عەرەقگێڕ.
مـــــــــــرۆ: مرۆڤ.
دەســــــتەمۆ: ڕام.
مــــــــشتومڕ: دەمەقاڵێ.
مکوڕبـــــــون: سوربون.
نۆکـــــــــەر: خزمەتکار.
نابـــــــــاوی: ناعادەتی.
نـــــــاگزور: پێویست، موحتاج.
نـــــــــامۆ: لابیدە، غەریب.
نامـــــــەخوا: ماشەڵڵا.
نــــــــاوازە: دەگمەن.
نەتـــــــەوە: ئومەت.
نــــــەخوازەڵا: خوانەخواستە، نەخاسمە.
نـــــــەفرەت: نەفرین، لەعنەت.
نـــــــەنگ: عەیب.
نەهامـــــــەتی: بەدبەختی.
نەهـــــــەنگ: ماسی زل، حوت.
نــــــــــزا: دوعا، پاڕانەوە، دوعای چاك.
نکـــــــــوڵی: ئینکاری.
نوزانـــــــــەوە: کڕوزانەوە، دەنگی گریاناوی دەربڕین.
نیـــــــــــاز: نیەت، مەبەست.
هەراســــــــان: بێزار، وەڕس.
هەســـــــارە: ئەستێرە.
هەڵلوشـــــــین: قوت دان.
هەڵوەســـــــتە: بێدەنگبونێکی کەم، وەستانێکی کەم.
هـــــــەناردن: ناردن، ڕەوانەکردن.
هــــــــــزر: بیر، فکر.
وادەگـــــــــا: ئەو شوێنەی دیاری دەکرێت بۆ پێك گەیشتن.
وەرچـــــــەرخێنن: وەرسوڕێنن، لابدەن.
وەچــــــــــە: نەوە.
ورە: عەزیمەت.
وێـــــــــــڵ: ڕێ لەبەر بزربوو.

# پێڕست

زاناو شارەزای بەناوبانگی مەیدانی بانگەوازیی ئیسلامی، کەڵەپیاوی کیشوەری هیندستان، خوا لێی خۆش بێ، (ئەبو الحسن الندوی) کاتێ بەسەرهاتی پێغەمبەران بۆ منداڵان و نەوجەوانان دەنوسێ، دەشێ تەمەن گەورەکانیش: باوکان، مامۆستایان، پەروەردیاران سودی لێوەرگرن و چاویان پێ رون بکەنەوە.

بۆیە شەهید سەید قوتب، وێرای باڵادەستی و شارەزایی لەم مەیدانەدا، دەڵێ:

"گەلێ پەرتوکی منداڵانم خوێندوێتەوە-کە بەسەرهاتی پێغەمبەران، درود و سڵاوی خوایان لێبێ، بەشێک بووە لە خوێندنەوەکەمدا- هەروەها لە دانانی زنجیرەی (القصص الدینی للأطفال) لە میسر، بەشداریم کردوە، کە بەسەرهاتەکانی ئەم زنجیرەیەش لە قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراون. بەڵام بێئەوەی مەبەستم دڵرازیکردنی کەس بێ، گەواهی دەدەم و دەڵێم: کارەکەی سەید ئەبولحەسەنی نەدوی لە هەموو ئەم کارانە کامڵترە.."

هەر بۆیە ئێمەش بە پێویستمان زانی و بە شادمانیەوە ئەم کتێبە ناوازەیە بکەین بە کوردی و بڵاوی بکەینەوە، تا منداڵە ئازیزەکانمان لەسەری پەروەردە ببن و لێی بەهرەمەند بن.

نوسینگەی تەفسیر

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر نوتێلی شیرین پالاس
ت: 2230908 - 2221695- 2518138
موبایل: 07701387291 - 07504605122

www.al-tafseer.com
E-mail: tafseeroffice@yahoo.com
altafseer@hotmail.com